پڕۆژەی تیشک

٤




منتدى اقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com

# فەتواکەی مەلای خەتێ

## ئەفسانەی مێژوونووسێك



نووسینی
حەسەن مەحمود حەمەکەریم

## بەناوی خوای گەورەو میهرەبان


ناوی کتێب: فەتواکەی مەلای خەتێ ئەفسانەی مێژوونووسێك

نووسەر: حەسەن مەحمود حەمەکەریم

شوێنی چاپ: چاپخانەی چوارچرا

ساڵی چاپ: ٢٠٠٦

نۆرەی چاپ: یەکەم

تیراژ: ٢٠٠٠

ژمارەی سپاردن: ٥٣٦ ساڵی ٢٠٠٦

لە بڵاوکراوەکانی پرۆژەی (**تیشك**) زنجیرە (٤)

Tishkbooks@yahoo.com

# ڕۆڵـــــی مـــــەلای خـــــەتێ لــە مــیرنـشـیـنــی ســـۆرانـدا

## پێش وتە:

كـورد یەكێكـە لـە گەلـە زینـدوەكانی سـەر گـۆی زەوی، مێژووەكـەی وا نیشـــان دەدات كـــە لـــە كـــۆنترین گـــەلانی ڕوژ هـــەلاتی ناوەڕاســـت بێـــت، سەرچاوەكان چالاكی و ڕوداوی زۆری ئەم میللەتەیان گێراوەتەوە، خـاوەنی مێژوویەكی دەوڵەمەندە، لەگەڵ ئەوەدا هێشتا هەر زۆر لای ونە ..

مێژووی كورد بە زۆری ڕۆژهەلاّتناس، یان داگیر كەرانی دەرو دراوسێ، بەزەینی دوژمنكارانەی خۆیان نووسیویانە، شێواندویانە، كەم و زیادیـان بـۆ كـردوە، لایەنـە بـەهێز و سـەروەرییەكانیان شـاردوەتەوە، لاوازەكانیشـیان بـە زەقـی دەرخسـتوە، بـەو جۆرەیـان نیشـان داوە كـە كـورد دڕندەیـە، نەزانـە، بێسودە، كاری لەسەر ناكرێ، بۆ هیچ هاوكێشەیەك ناشێت...

ئـەوە ستەمە لـە كوردمـان، لـە خاكمـان، لـە بونمـان، لـە مێـژوومان، لـە چارەنوسمان كراوە، بۆ ڕاست كردنـەوەی، هـەوڵی دڵسۆزان، ڕەنجـی شـەو و ڕۆژ، كات و سات و ماوەی زۆری دەوێت ..!!

مێژوو پێویستیەكی گرنگە، میللەتانی تر زۆر گوێیـان پـێ داوە، تـەنها لـە ئەورووپا ٣٥٠ دەزگای نووسینەوە و لێكۆڵینەوە لە مێـژوو هەیـە، بـەردەوام لـە نووسـینەوە و خوێندنـەوەو گـەڕان و كنـەو پشـكنینی شـوێنەوار و ئاسـەوارو ئەفسـانەكاندان .. بـەلاّم كـورد هێشـتا بەرچـاوی ڕابـووردوی دیارنیـە، لـە مێژووەكەی دوورە، هەر بۆیـە پاشـە ڕۆژی ڕون نیـە، كـاری پێشـینانی بـە هـیچ دەزانێـت، بێ نـرخ سـەیری دەكـات، بـە دەسـتی خـۆی، ئاسـەوارە بەنرخـە پـڕ سـەروەریەكانی ژێـر زەوی هەڵدەتـەكێنێت و، ئـاودیوی سـنوری دەكـات، ڕوداوەكانی باو باپیری بە ئەفسانەو شتی پڕ و پوچ لـە قەڵەم دەدات، هەسـتی پاراسـتنی كولتـوور و كەلـەپوری خـۆی نیـە، نازانێـت ئەوانـە جـێ دەسـتی پێشـینانی ئـەون، دەبێـت پـیرۆز و بـەڕێز و بـەنرخ سـەیر بكـرێن و، ئـەمرۆی

خۆیانی تیا بخوێننەوە، نرخی كاری پێشوەكانی تیا بدۆزنەوە , ئایندەی تیا دیاری بكات، چونكە ئەوەی مێژووی نەبێ، كەسێتی ونە و نیە، ناتوانێ خۆی بناسێ, یان خۆی بناسێنێ..

لێكۆڵەرەوە و مێژوونوسان, زۆریان باس لە پێناسەو گرنگی مێژوو كردووە، ووتویانە ( مێژوو زانستێكی گەورە و بە كەڵكە، بەڵكو زانستی زانستەكانە، هیچ زانیاریەكی گرنگ نیە مێژووی تایبەتی خۆی نەبێت، لە هەمووان گرنگ تر مێژووی ژیانە، كە گشت زانست و ڕوداوەكانی ڕۆژانەو ئاڵو گۆڕەكانی كۆمەڵ دەگرێتەوە، بۆ هەركەسێك بیەوێت وانەكانی مێژوو زۆر گەورەن ... نەمری ڕاستەقینە لای مێژووە ... ) ئەمە وتەی مامۆستا كەمال مەزهەر بوو. شەرەفخانیش پێش ٥٠٠ ساڵ لەمەو بەر وتویەتی ( مێژوو لە سەروی هەموو هونەرەكانەوەیە ...) مێژوونوسی یۆنانی هیرۆدۆت, كە ٢٥٠٠ ساڵ لەمەو بەر ژیاوە و, بە باوكی مێژوو ناودارە, بۆ مێژوو دەڵێت ( مێژوو گەڕان و پشكنینە بەدوای كرۆكی ڕوداو و كارەساتە كۆنەكاندا ..)، واتە یۆنان لەو كاتەوە تا ئەمڕۆ مێژووی خویان نوسیوەتەوە ... (تەبەری) عەرەب, پێش زیاتر لە ١٢٠٠ساڵ لەمەو بەر وتویەتی ( مێژوو هونەرێكە لە ڕوداوەكانی ڕۆژانە دەكۆڵێتەوە ...) مسعودی و سەخاوی و ئیبن خەلدون و دەیانی تر, هەر یەكەیان جۆرە پێناسەیەكیان بۆ مێژوو هەیە و, بە گرنگی باسیان بۆ میللەتەكەی خۆیان كردووە .. بەڵام كورد هێشتا لە ناسینی مێژووی خۆیدا ساوایە ...

گەر تێڕوانین هەبێ, مێژوو نەوەیەكی ژیری وا دێنێتە گۆڕێ، كە هەڵەكانی كۆن, وەك ئاوێنەیەك لە بەر چاوبگرێ و دووبارەیان نەكاتەوە، شارەزای ژیان و ژیارو كردار و گوفتاری ڕابوردوومان دەكات، میللەتی چاك دێنێتە مەیدان، كورد خاوەنی مێژووی دەوڵەمەندی خاوەن ڕوداوو داستانە, پڕیەتی لە ئەزموون، چەندەها هاوكێشەی تەواوو و ناتەواوی لە سەر خاكەكەی بینیوە، بوەتە تاقیگەیەكی گەورە و پڕ لە (وانە )، دەتوانێت نەخشەی نوێ و پرۆژەی چاك و سەركەوتوانەی لێ بەرهەم بهێنێت ...

مـەخابن .. ئەگـەر سـەیری بـارو دۆخ و ژیـانی دوێنێـی كـۆن و ئـەمڕۆی نوێمان بكەین، پێوەی دیار نیە كە كورد مێژووی خۆی شەن و كەو كردبێت، یاخود بەو چاوەوە سەیری كردبێت, كە خۆی تێدا بدۆزێتەوە، نابینی سوود لە ئەزموونە پێشووەكان وەرگیرابێت، هەڵەكان نەك جارێك, بەڵكو دەیان جار دووبارە بونەتەوە، هەموو جاریش, دەرەنجامی پێشوو چنگ كورد كەوتوە ..

مەخابن.. كورد مێژووی پڕ ئەزمونی بە دەرمانخانەیەك نەزانیوە، تاوەكو دانایانە تیماری دەردەكانی تیا كردبێت .. ئەمە لەلایەك .. لەلایەكی ترەوە، نووسـەرانی مێـژووی كـورد, لـە بـری ئـەوەی دەسـت نیشـانی خـاڵی لاواز و بەهێزی ژیانی كۆنی كورد بكەن، هاتوون مێژوەكەیان وەك چیرۆك خوێنەكانی ناو دیوەخانی شەوانی زستان و بەر ئاگردان گێڕاوەتەوە، تەنانەت خۆشیان لەگەڵیانـدا هەڵچـوون و داچـوون و, ئەوەنـدەی تـر بابەتەكـەیان ئـاڵۆزتر كردووە...

دەبا خوێنەران و سەركردەكانی كورد، مێژووەكەمان بە دەرمانخانەیەكی پڕ لە ئەزموون و وانە سەیر بكەن, بە گەوهەرێكی جێماوی دانسقەی بزانن، خـەڵكانی كـوردیش ئاسـەوارە جێماوەكـانی باپیرانمـان بـە یادگـاری پێشینەكانمان بزانن و بە هەرزان لە دەستی نەدەن ..!!

یـەكێك لـە قۆناغـە گرنگـەكانی مێـژووی كـورد، چـاخی مـیرو میرنشـینە كوردەكانـە لـە سـەردەمەكانی ئیسـلامدا، لـە هـەموویان گـرنگتر, میرنشـینی سـۆرانە, كـە زیـاتر لـە پێـنج سـەد سـاڵ دەنـگ و باسـیان لـە سـەر خـاكی كوردستاندا هەبوەو, هەتا ئێستەش ئاسەوارەكانی نەبڕاوەتەوە...

سۆرانیەكان هەلێكی مێژوییان بۆ هاتە پێش, قۆستیانەوە, لەو ساتەوە هاتنـە سـەر مەیـدانی گۆڕەپـان و خۆیـان نوانـد، كاریگەریـەكی گرنگیـان لەكوردسـتاندا هـەبوو، لەكۆتایـدا بـەهۆی میرێكـی سروشـت تونـدو شـەڕەنگێزەوە, كـە ئەوەنـدەی كێشـا بەمیرنشـینە كوردەكـانی دەوروپشـت و دەرو دراوسێدا، هەتا بەهەر هەموویانەوە گەلەكۆمەكییان لێكردوو لەناویان برد، بەڵام هەندێ لـە نووسـەران و مێژوونووسـان، هەریەكە بێئاگا لـە وردی

رووداوەكان‌و فاكتەرە گرنگە ناوخۆیی و دەرەكیەكانی سەردەمەكە، هەموو هۆكانیان وەلاوە ناوەو, تاكە خالێك كە زەقی بكەنەوەو بەڕوونی نیشانی بدەن و هاش و هوشی پێوە بكەن، رۆڵی (مەلای خەتیٚ)یە، كە گوایە بە چەند دێڕە فتوایەك ئەو میرنشینە مەزنە بەهێزە فەوتاوەو, دراوەتە دەستی دەوڵەتی عوسمانی..

لەم تاوانباركردنەدا, كۆمەڵێك نیازو مەبەستی جۆراوجۆر كۆدەبنەوەو لە خالێكدا یەكدەگرنەوە، ئاواتی چەند كەسانێكی سەدەیەك پێش ئێستەی ناوچەی سۆران دێتە دیو, نووسەرە چەپەكانیش دەستی چەوری چەند سەدەیەك نە هەڵە و بێئەزمونی سەركردەكانی كوردی ئەو كاتانە. دەنێنە سەر مێزەری سپی سەرسەری تاكە كەسێك, كە بە مەرجێك هەتا كاتی كەوتنی میرنشینەكە, بەهیچ جۆرێك ڕۆڵ‌و كاریگەری لەناو میرنشینەكەدا دیارنەبووە...!!

كەوتنی میرنشینی سۆران لەلایەن عوسمانیەكانەوە, بەیارمەتی سەربازی ڕوسیاو ئێران‌و هەرێمی بەغدادو موسڵ و نەخشەی بەریتانیاو, بە یارمەتی سەدان چەكداری كوردی سۆران, كە لە دەستی میر محەمەد هەڵهاتبون و لە گەڵ سوپای عوسمانی گەڕابونەوە، لە گەڵ چەكدارانی چەند میرنشینێكی كوردی تردا, بە نەخشەی سەربازی پسپۆڕانی بەریتانیا, ئەو كارەساتە گەورەیان لە مێژووی كوردا دروست كرد, شكستەكە هێندە بەسۆبوو, كە نووسەرانی مێژووی كوردی وا هەژاندوە, ئەو هەموو نەخشەو هێزو تۆپ وجبەخانەیە لە بیر بكەن و, تاوانی كەوتنەكە بدەنە پاڵ (مەلای خەتیٚ), كەتا ئەو كاتە هیچ دەسەلاتێكی لەومیرنشینەدا نەبوە. مەلای خەتیٚ تەنها مەلای مزگەوتێك بووەو هیچی تر, دەنا میر محمد لە بڕیاری ئیداری و سیاسی‌و سەربازیدا, تەنهاو بە تەنها پشتی بەعەقلیەتی عەسكەرتاری خۆی بەستوە، هەرگیز نەبووە پرس و ڕا تەنانەت بەبراكان‌و مامەكان‌و سەركردەكانیش بكات، لەهەموو سەردەمی میر محمددا یەك بەڵگەنامە نیە, كە میر محەمەد

ڕاویّژوو پرس و ڕای بە براكانی یان سەركردەكانی یان مەلای خەتیّ كردبیّ، پرسیّكی شەرعی نەكردوە، ڕای خەڵكی میرنشینەكەی وەرنەگرتوە..!! ..

لە گەڵ ئەوەی هەموو بەڵگەنامەكانی دەوڵەتی عوسمانی كراوەتە كتیّب و لە بازاڕدا هەیە، بەلاّم هەتا ئیستە ئەو فتوایەی مەلای خەتیّمان نەبینی، كەواتە ئەو باسە دروستكراوەو هیچ ڕاستیەكی تیا نیە..

بۆ یەكلاكردنەوەی ئەو راستیانە، ئەوەندەی سەرچاوەكان یاریدەمان بدەن، لیّكۆڵینەوەیەك دەخەینەڕوو، كەسایەتی میر محەمەد، هۆی كەوتنی میرنشینەكە، رۆڵی تەواوی (مەلای خەتیّ)، لەزنجیرەی باس و رووداوەكاندا ڕون دەكەمەوەو وەك خۆی نیشانی دەدەم...

بەهیوام لەم هەوڵەمدا لەراستی نزیك بوویێتمەوە...

# سەرهەڵدانی میرنشینی سۆران

## زنجیرەی میرەکان:

بەتەواوی روون نییە مێژووی میرنشینی سۆران لەکەیەوە دەست پێدەکات، بەلاّم ئەوەی کە هەتا ئێستا ساغ بووەتەوە ئەوەیە کە لەسەدەی دوانزەهەمینی زاینی[1]، یان سەدەی پانزەهەمینی زاینییەوە[2] دەرکەوتوون، دامەزرێنەری میرنشینەکە کەسێك بووە بەناوی (عیسای کۆڵۆس)[3]، سێ کوڕی هەبووە بەناوی عیساو ئیبراهیمو ئیدریس، عیسا لە هەلێکدا کە ستەمێك لەسەر ناوچەکەی لادەبات، مەزن دەبیٌو دەکرێتە گەورەی خەڵکەکە، بەوەوە ناوەستێ، هێز کۆدەکاتەوەو پەلامار دەدەنو چەند قەلاّیەکیتر دەگرن، بەو جۆرە سنووری خۆیان فراوان دەکەنو شاری (حەریر) دەکەنە پایتەخت[4]، (عیسا) دەمرێ، (شاعەلی) کوڕی دێتە جێی[5]، لەسەدەی پانزەهەمەوە هەتا سەدەی نۆزدەهەم نزیکەی هەژدە میر دەسەلاّتی میرنشینی سۆران دەگرنە دەست، وەرگرتنی دەسەلاّت لەناویاندا پشتاو پشت بووە، هەر وەکو لەهەموو میرنشینە کوردەکانی تردا بەڕێوە چووە[6]..شاعەلی میرنشینەکەی لەنێوان کوڕەکانیدا دابەشکرد، (میر عیسا) ی کوڕی لەسەر (هەریر) دانا، بەلاّم لە شەڕی بابانەکاندا کوژرا، (میر بداغ بەگ) ی برای جێی گرتەوە، دوای ئەویش (میر سەید) ی کوڕی شاعەلی بوو بە میری سۆران، بەلاّم لە تۆڵەی کوژرانی میر عیسای برایدا بە دەستی بابانەکان، هەلێك دەقۆسێتەوە، کاتێ میری بابان خەریکی راوو شکار دەبێت، بەنهێنی بۆی دەچێو دەیکوژێ، لەسەردەمی ئەمدا سنووری سۆران دەگاتە (هەولێرو

---

[1] گۆڤاری کاروان، ژمارە (٥٢).

[2] اربیل في الماضي والحاضر. مجموعة من المؤلفین. ص٣٤ کەریم شارەزا.

[3] شەرەفنامە. شەرەفخانی بدلیسی. وەرگێڕ بۆ کوردی هەژار موکریانی. ل ٤٨٢ نەجەف ١٩٧٢.

[4] مێژووی میرانی سۆران. حسین حوزنی موکریانی. ل ٥ هەولێر ١٩٦٢

[5] کوردو کوردستان. محمد امین زەکی. ج٣ ل ٣٩٤. ٣٩٥ مهابات.

[6] میرنشینی سۆران. کامەران جەمال بابان. ل٢٤ هەولێر ١٤١٩

کەرکوك‌و موسڵ[٧].. ئەمە لە ساڵی (١٥١٦ز) ی زایینیدا بوە، (میر سەید) لەسەر ئەسپ دەکەوێتەخوارو دەمرێ، (میر عیزەدین شێر) ی کوڕی دەبێتە میری سۆران.. زۆر نابات ساڵی (١٥٣٤ز) سوڵتان (سولەیمانی قانونی) کە لەباکوورەوە دەگەڕێتەوە دێتە هەولێر، میری سۆران بەخێرهاتن‌و ڕێز لێگرتنی باشی دەکات، بەلاّم گوایە (میر عیزەدین) پەیوەندی بە (شا تەهماسپ) ی ئێرانی سەفەویەوە دەبێ، لە بەر ئەوە دەیکوژێ‌و، ناوچەکە بە هەولێرەوە دەداتە (حوسەین بەگی داسنەیی) میری یەزیدیان، ئەمە هەر بۆ دوژمننانەوە بوە لە نێوان کوردە موسوڵمانەکان و یەزیدیان دا، زۆری نەبرد (میر سەیفەدینی کوڕی میر حوسەینی کوڕی پیر بداغ) دەسەلاّت لەناوچەی سۆران پەیدا دەکات‌و هێز پێکەوە دەنێ، لە چەند شەڕێکی قورسدا داسنەییە یەزیدەکان راودەنێت‌و، هەولێرو ناوچەکەیان لێ پاك دەکاتەوە، بەلاّم سوڵتانی عوسمانی (میر سەیفەدین) بانگ دەکاتە ئاستانە (ئەستەمبوڵ) بۆ وتوێژو ڕێکەوتن، بەلاّم بە پلانێك دەیکوژێت، (میر قولی بەگ) ی کوڕی دێتە جێی، ئەویش چەند شەڕێك لەگەڵ داسنەییە یەزیدییەکان دەکات، بەلاّم سەرناکەوێت، ناچار پەنا دەباتە بەر ئێرانی سەفەوی، پاشان (میر قولی) دەمرێ‌و (بداغ بەگ) ی کوڕی قولی بەگ دێتە جێگەی، ئەویش بە هۆی ناکۆکی لە گەڵ (میر سولەیمان بەگ) ی برا بچووکیدا، پەنا دەباتە بەر (میری ئامێدی)، بەلاّم ساڵی (١٥٥٩ز) دوور لە ناوچەی سۆران، لە شاری ئامێدی بەداخی برا بچووکەکەیەوە دەمرێت.

میر سولەیمان بەگ، زیاد لە (٣٠) ساڵ دەسەلاّتی هەبوو، ئاسەوارێکی زۆری قەلاّو شوورەی جێهێشتوە[٨].. پەلاماری هۆزی کوردی (زەراری) لە ناوچەی (شنۆ) دەدات، پاشان پەلاماری قزڵباشە سەفەویەکانی داوەو دیلە سەفەویەکانی بەدیاری ناردوە بۆ سوڵتانی عوسمانی[٩]، بەلاّم (والی بەغداد)

[٧] شەرەفنامە. ل ٤٩٠ پەراوێز.

[٨] مێژووی کورد لەکۆنەوە تا ئەمڕۆ. ساڵح قەفتان. ل٢٩٦ بغداد ١٩٦٩.

[٩] شەرەفنامە ل٤٩٩.

بە فیلٚ بانگی دەكات و دەیكوژیٚت[10]...پاشان (عەلی بەگ) ی كوڕی دیٚتە جیٚی, ساڵی (١٥٩٠ز ) پایتەخت لە (حەریر) ەوە دەگوازیٚتەوە بۆ (خەلیفان)، هەتا ئیٚستاش ئاسەواری قەڵاو پردی بەدیارماوە, ئەم میرە چل ساڵ ناوچەكەی بەڕیٚوە دەبات[11] , ساڵی ( ١٥٩٠ز) مردوە[12]...هەندیٚ تر دەڵیٚن ساڵی (١٦٢٤ز) مردوەو (ئوغوز بەگ) و (میرە بەگ) ی لەدوا بەجیٚماوە [13]..

(ئوغوز بەگ) جیٚی بابی دەگریٚتەوە، (ڕەواندوز) ی لە دەست دوژمنان ڕزگاركردەوە، ساڵی (١٦٤٥ز) كردیەوە پایتەخت، ساڵی (١٦٩٥ز) مرد، (میرەبەگ) ی برای چووە جیٚی، پاش ماوەیەك ئەویش مرد، (میر ئەحمەدی كوڕی ئوغوز بەگ) جیٚی گرتەوە، ئەویش ساڵی (١٧٥٦ز) ڕۆژیٚك لە كاتی ڕاودا دەبیٚ بە دەردی خوا دەمریٚ، (میر ئوغوزبەگی بچووك كوڕی میر ئەحمەد) دیٚتە جیٚی، ساڵی (١٧٦٨ز) ئەویش دەمریٚ و شەش كوڕی لەدوا جیٚدەمیٚنیٚ، (مستەفا بەگ، تەمەرخان، یەحیا بەگ، بایز بەگ، ئەحمەد بەگ)، هەریەكە لەمانە لایەكی میرنشینەكە دەبەن بەڕیٚوە ...

تەمومژ لەسەر میرەكانی سۆران زۆرەو، میٚژووی ژیانیان و ڕووداو و بەروارەكانیان تیٚكەڵەو روون نییە ...!!

كە (میر ئوغوز بەگ) مرد، وەك برا گەورە كە باوكیشی ڕەزامەندی هەبوو (مستەفا بەگ) ی كوڕی چووە جیٚی، ئەو كاتانە سەرەتای حەفتاكانی سەدەی هەژدە بوو، گەرچی پیاویٚكی زیرەك و بەتوانابوو، بەڵام بارودۆخی ناوچەكە شیٚرز بوو، لەولاشەوە براو ئامۆزاكانی چاویان بڕیبوە دەسەڵاتی و هەریەكە پارچەیەكیان بۆ خۆیان دابڕی بوو، هەر بۆیە ناچار بوو دەسەڵاتی میرنشینەكەی بە كوڕە گەورەكەی بسپیٚریٚ[14]

---

[10] میٚژووی كورد لەكۆنەوە تائەمڕۆ. ل٢٩٦.

[11] اربیل في ادوارها التاریخیة ـ ص ٢٧٤.

[12] میٚژووی میرنشینی سۆران ـ موكریانی ـ ل ١٤.

[13] شەرەفنامە ـ ل٥٠٤ پەراویٚزی هەژار .

[14] میرنشینی سۆران ـ كامەران زادە ـ ل ٢٩.

## میر موحەمەد ( پاشا کۆرە )

(مستەفا بەگ) هەر لەسەرەتاوە کە ئەو ناکۆکیو چاوتێبڕینەی کەسەکانی دەبینی، نیەتی خراپیانی هەست پێکردبوو، ناچار لە هەوڵی پێگەیاندنی کوڕە گەورەکەی دەبێت، هەتا ئامادەی بکات بۆ جێنشینی خۆی...هەر لە منداڵیەوە (میر محمد)ی خستە بەرخوێندنی حوجرەو مزگەوتێکی تایبەتی بۆ دروستکرد، بەرزترین زانای ناوچەکەی بۆ دابینکرد هەتا رۆژانە زانستو خوێندەواری فێر بکات، ئەو زانایە ناوی (موحەمەد بن ئادەم) بوو، کەخاوەنی قوتابخانەیەکی ئاینی سەلەفی ئامێز بوو لە ناوچەی باڵەکایەتیو سۆران، سەرۆکی زانایانی ناوچەکە و حوجرەیەکی قەرەباڵغ و کتێبخانەیەکی دەوڵەمەندی هەبوو، خۆیشی زیاتر لەپەنجا بەرهەمی جۆراوجۆری هەیە کە زۆربەیان دەست نوسن و لای بنەماڵەکەیان تا ئەمڕۆ ماوەتەوە.

ئیبن ئادەم هەموو وانە زانستیو ئایینیەکانی لە (میر موحەمەد) گەیاند، پاشان (مستەفا بەگی) باوکی ناردیە ناوچەی (چۆڵە مێرگ) هەتا فێری کاروباری بەڕێوەبردنیش ببێت...

براکانی (مستەفا بەگ) جارێك (بابانیەکان) یان دەهێنایە سەر (مستەفابەگ) و، دەمێ خۆیان سازدەکردو کێشەیان بۆ دەنایەوەو ناوچەی زیاتریان لێ دادەبری، بەو هۆیەوە بابانیەکان (رانیەو کۆیەو هەریر)یان لە (سۆران) سەند، لەولاشەوە (تەیمورخان بەگ) ی برای (هەودیان) و (شەمزینان) ی کردە هی خۆی، (بایز بەگ) ی برایشی دەشتەکانی (رەواندوز) و ناوچەی (برادۆست) ی بەرخۆیدا ... وای لێهات تەنها بە تەنها شاری (رەواندوزو سەرچیاو دۆڵی وەرانو چۆڵەمێرگ) بۆ (مستەفا بەگ) مایەوە، بابانیەکان لەوەدابوون ئەوەشی پێرەوا نەبینن، هێرشیان هێنایە سەر (رەواندوز)، (مستەفا بەگ) سیاسەتی لەگەڵ گۆڕینو لەگەڵیان رێککەوت، بەلام (تەیمورخانو یەحیا بەگ) ی برای هەر وازیان نەدەهێناو جارێکی تر لە ساڵی (١٧٨٧ز) دا بابانیەکانیان هێنایەوە، چەند ناوچەیەکیان لە سۆران

گرت، بەلاٚم (مستەفا بەگ) خراپ شکاندنی و خواردەمەنیو تەقەمەنیەکی زۆری لیٚگرتن، (مستەفا بەگ) لە دەست براکانی وەڕس بوو، سالّی (١٨٠٨ز) (میر موحەمەد) ی کوڕی بانگکردەوەو کردیە میری سۆران، (مستەفا بەگ) چوار کوڕی هەبوو، (موحەمەدو رەسولّو سولەیمانو ئەحمەد)... میر موحەمەدی بە ئازاترو سیاسی ترو ئامادەتر دەزانی، هەر بۆیە خستیە جیٚی خۆی...[١٥].

بەم جۆرە، چوونە ناوەوەی باسەکان سەر بوردیٚکی دوورو دریٚژە، بە هیٚندەی ئەوەی کە دەمانەویٚ بە خیٚراتر لەو مەبەستە نیٚزیك ببینەوە کە نیازمانە.

هەتا سالّی (١٧٣٠ز) شاری (دوین) پایتەختی میرنشینی سۆران بوو، پاشان لە ترسی هەڕەشەی بابانەکان گوازرایەوە بۆ (هەریر)، پاشتریش لەسالّی (١٧٨٧ز) دا گوازرایەوە بۆ (خەلیفان)[١٦]، پاش ئەویش گوازرایەوە بۆ شاری (رەواندوز)[١٧]..ئیتر لیٚرەدا جیٚگیربوو، هەتا فەوتانی میرنشینەکە بە پایتەخت مایەوە.

وتمان سالّی (١٨١٣ز) میر موحەمەد کرایە میری سۆران [١٨].. هەر کە دەستی لە جلّەوی دەسەلاٚت گیربوو، گۆڕانکاری زۆرکرد، هەنگاوی خیٚرای دەنا، هیچ ترسی لە ئەنجامو پاشەڕۆژ نەبوو، چی بویستایە دەیکرد، بەڕیٚوەبەرانی ناو رەواندوزی گۆڕی، هەموو دەرەبەگو سەرەك هۆزو خیٚلّەکانی کۆکردەوەو یەکیخستن، پەیکەری نویٚی لەسەر دامەزراندن، خزمەکانی بەوە زویربوون، باوکی وتی: "دلّی کەس مەڕەنجیٚنە، میر مەرجی بۆ باوکی دانا کەدەست نەخاتە کاریەوەو، ناردیە دیٚی (هەودیان) هەتا مرد"...

---

[١٥] شەرەفنامە . ل٥٠٦.

[١٦] عەلی بەگ، میری سۆران پایتەختی گواستەوە بۆ خەلیفان.

[١٧] ئوغوز بەگ کوڕی عەلی بەگ، پایتەختی گواستەوە بۆ رواندوز.

[١٨] اربعة قرون من تاريخ العراق الحديث . لونگريك، ترجمه جعفر خياط ص٢٤٢ بغداد١٩٦٨.

سەربازەکانی کۆکردەوە، جارێکی تر رێکیخستنەوە، یەکەم لێدانی لەمامەکانی بوو، ساڵی (١٨١٥ز) (هەودیان) ی گرت و (تەمەرخان) ی مامی کوشت کە خۆی بەجیاو دوژمن بە میر محەمەد دادەنا، پاشان روویکردە (یەحیابەگ) ی مامی و ئەویشی کوشت[١٩] بەمە گرفتی ناوخۆیی نەما، ئەنجا پەیکەری نوێی میرنشینەکەی دامەزراندەوە، (میرزا موحەمەد) ی کردە سەرۆکی نووسەران و، خەریکی نووسینەوەی مێژووی رووداوەکان بوو، قەڵاو سەنگەری بەهێزی بەدەوری رەواندوزدا لێدا، سێ دەروازەی بۆ شار دامەزراند، دوو بورجی بەرزی بۆ پارێزگاری دەروازەکان دروستکرد، کۆمیتەیەکی جەنگی پێنج کەسەی پێکهێنا، میر خۆی سەرۆکی بوو، (رەسوڵ بەگ) ی برای کردە سەر پەرشتی گشتی جەنگی، (ئەحمەد بەگ) ی برای کردە فەرماندەی سوپا.

(وەستا رەجەب) ی کردە بەرێوەبەری کارگەی تۆپ و جبەخانە، (خان گێڵدی) بەرێوەبەری کارخەی خەنجەرو دارتاشی بوو، (وەستا برایمی ماویلی) کردە سەرۆکی وەستاکانی دروستکردنی قەڵاو شوورەو سەنگەرو رێگاوبان، (مستەفا ئاغا) سەرۆکی بازرگانان بوو، دەستەیەکی شەش ئەندامی بەناوی (دەستەی سەرداران) دامەزراند، خۆی سەرۆکی بوو، کۆبوونەوەی هەفتانەی هەبوو، لەگرفتی مەردمی دەکۆڵیەوە، (ئەنجومەنی زانایان) و (ئەنجومەنی حەکیمان) ی دامەزراند بۆ دارشتنەوەی یاسا[٢٠].

ئەم کارانە بویە جێی سەرنجی شارەزایانی ئەوروپی و عوسمانی و ئێرانی، چاویان تێبڕیبوو، حەوت جۆر (سکەو پارە) ی بەناوی خۆیەوە لێدا، لە وتاری هەینیدا وەك سەرۆکێکی سەربەخۆ ناودەبرا، سەرەتاو لەسەردەمی باوکیشیدا زانای ناوداری کورد لە رەواندوز، کە مامۆستای میر موحەمەد خۆیبوو، ناوی

---

[١٩] کوردەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی . د.جلیلی جلیل . وەرگێر لەروسیەوە . د.کاوس قەفتان . ل١٣٨ بغداد ١٩٨٧

[٢٠] گۆڤاری کاروان ژمارە (٨) خولی راپەرین ١٩٩٣ ل٦ - ١٢ ئەحمەد باوەر.

( ئیبن ئادەم) بوو, موفتی میرنشینەکەی بوو، لەبەر ئەوەی کە هەندێ بڕیارێ میر موحەمەدو قەتڵ‌و عامی بێ‌بەزەییانەی مام و ئامۆزاو خزمان و, خەڵکی تێ لە ژن‌و منداڵی کورد, کە لە گەڵ شەرعدا نەدەگونجا، ئیبن ئادەم لەفەتوا بێ دانیان خۆی دەپاراست، ناکۆکی لە گەڵ میر محەمەددا بۆ دروستبوو، وازی هێنا، بەلاَم ئیبن ئادەم یەکێك لە قوتابیە زیرەکەکانی خۆی کردە موفتی میرنشین بەناوی ( محمد ئەفەندی شێخ سلێمانی)[21] کە بە (مەلای خەتێ ناسراوە، بەلاَم هەندێك دەڵێن (داود پاشا)ی والی بەغداد بۆی نارد, هەتا سوودی لێ ببینێ‌و بۆ بەرژەوەندی خۆی بەکاری بهێنێ[22] , یان دەڵێن مەلای خەتێ پەروەردەی دەستی (داود پاشا) بوە [23] هەندێکی تر دەڵێن مەلای خەتێ یەکێك بووە لە پیاوانی دەوڵەتی عوسمانی، ئەو تەنها پیاوێکی ئاینی نەبوە...[24] یان دەڵێن کاتێ مەلای خەتێ گەیشتە رواندوز، هەندێ زانا شاریان چۆڵکرد, وەك زانای گەورە (محمدی کوری ئیبنی ئادەمی باڵەکی[25]. ئەمانە هەموو قسەو قسەڵۆکن, دوای دروست کردنی فتواکە بۆ مەلای خەتێ ئەم وتانەشیان دروست کرد..!!

(مەلای خەتێ) قوتابی دەستی ئیبنی ئادەم بووە، خۆی ئیجازەی مەلایەتی داوەتێ [26] ئەی کەواتە بۆچی (ئیبن ئادەم) لە رەواندوز نەما، کۆچیکرد بۆ ناوچەی باڵەکایەتی ..؟ لەسەر ئەمە قسە زۆرە، هەندێك لە نەوەکانی (ئیبن ئادەم) دەڵێن (ئادەم) پیر بووبوو تاقەتی نەمابوو، ئەوی

---

[21] مجلة الحكم الذاتي . العدد (٤) السنة السابعة . زبير بلال اسماعيل . محمد الخطي ونهاية الأمار السورانية.

[22] گۆڤاری کاروان ژمارە ٥٣ . بەشی دووەم، عبدالفتاح عەلی یەحیا.

[23] تأريخ العراق بين احتلالين، ج٧ ص٢٣، عباس العزاوي.

[24] گۆڤاری کاروان ژمارە ٥٣.

[25] هەمان سەرچاوە ل ١٥١.

[26] بنەماڵانی بەناوبانگی رەواندوز . ممدوح مزوری، ل٤٩ هەولێر ١٩٩٨.

ئیزنی لە میری رواندوز خواستو گەڕایەوە بۆ باڵەکانو لە گوندی (دیّلزە) دامەزراو دانیشت[٢٧]، بەلاّم هەندیّ لەمیّژوونووسانی شارەزا ئەڵیّن هۆی رۆیشتنی (ئیبن ئادەم) ناکۆکییەك بوو لە نیّوان (ئیبن ئادەم) و میری رەواندوز، ئەوجا ناچار لە رەواندوز باریکردو چووەوە گوندەکەی خۆی (گوندی رۆست)، پاشان لەویّش باریکردوو چووە دیّی (دیّلزە).

ئەم گوتنە لە ڕاستیەوە نزیکترە، چونکە (ئیبن ئادەم) لە کتیّبی خۆی بە ناوی (سلسلة الذهب) پەنجەی دریّژکردوە بۆ ئەو ناکۆکیەی نیّوان خۆیو میری رەواندوز, کە ئەو فەرمانی پیّکردوە بچیّ لە گوندی خۆی (رۆست) دابنیشی[٢٨].

(ئیبن ئادەم) سەفەرو وەغەری زۆری کردوە، ساڵی ١١٩٢ ی کۆچی چوەتە شاری (مهابات) بۆ فیّربوونی زمانی فارسی، پاشان لە (مهابات) ەوە گەڕاوەتەوە بۆ (رەواندوز), لە سەردەمی میر موحەمەدداو سەرگەرمی دەرس وتنەوەو کتیّب دانان بووە، پاشان گەڕاوەتەوە گوندی (رۆست) لەناوچەی (باڵەك)، لە (رەواندوز) لای (میر موحەمەد) دامەزراو بوە مەلاو زانای میری سۆران ..میریش دەرسخانەو مزگەوتیّکی بۆ دروستکرد لە (قەلاّتیلوکان) لە دەرەوەی شوورەی کۆنی رواندوز[٢٩](ئیبن ئادەم) مرۆڤیّکی هەقو رەق بووەو, رۆحیّکی قەومیی زۆر بەهیّزی هەبووە، دۆستی مرۆڤی هەژارو, هەوەسی بە مرۆڤی زۆردار نەهاتووە، لەبەرئەوە میرو ئاغاو بەگەکان هەوەسیان بە (ئیبن ئادەم) نەهاتووەو، هەر لەبەر ئەوەش بوە (ئیبن ئادەم) هەمیشە لە بارکردندا بووە، لە هیچ شویّنو ولاّتیّك جیّگیر نەبووە، هەروەها (ئیبن ئادەم) دژی کۆلکەشیّخان بووە, هەمیشە لە گەڵیان لە ململانیّو شەڕی بووەو, (شیّخی بەردە کوڕە) ی کوشتوە, سەبارەت بەکاری ناپەسەندو بیّشەرعی[٣٠].

---

[٢٧] هەمان سەرچاوە ل٦٣.

[٢٨] گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد ـ بەرگی (٥) ل ٤٦٧.

[٢٩] بنەماڵەی بەناوبانگی رواندز ـ ل ٦٢

[٣٠] هەمان سەرچاوە ـ ل ٥٨ ـ ٦٠

(مەلا سەعیدی کوڕی مەلاوەیس) کوڕە زازای ئیبن ئادەم، لە سەردانێکدا بۆ مالّیان، باسیکرد کە (ئیبن ئادەم) ی باپیری زۆر توندو دژ بەکاری ناشەرعی بووە، ئەگەر بیبیستایە کەسێك بەسەر ئیسلامەوە مشەخۆرە، یان بیدعەیەکی خراپی داهێناوە، بەخۆیو فەقێکانەوە بۆی چووەو خراپی پێکردوە[٣١]..ئەمە ئەوە دەردەخات کە مەلای خەتێ هیچ دژایەتیەکی زانایانی ڕەواندوزی نەکردوە، بەڵکو یەك ڕایان بوە، وەك هەندێك بەبێ سەرچاوەو، بۆ مەبەستێك باسو خواسی ئەو کەسایەتیە دەشێوێننو، هەر لە خۆیانەوە خەڵکانێك ناشرین دەکەن..!!

(مەلای خەتێ) هەموو تەمەنی لە دژایەتی دەوڵەتی عوسمانی دا بەخت کردبوو، چ لە ناوچەی سۆران کە لای (ئیبن ئادەم) و (ئەبوبەکر ئەمیر روستەمی) فەقێ بوە، هەموو زانایانی کوردی ئەو کاتە دژ بەستەمی عوسمانی بوون، پاشانیش کە لە سەرەتای سەدەی نۆزدەدا دەچێتە (بەغداد) بۆ خوێندنو وانە وتنەوە. لە بەغداد بە هۆی توانایی خۆیەوە، بوو بوویە کەسایەتیەکی ناوداری بە غداد و عێراق، کەسایەتیەکی کاریگەری هەبوو بە هۆی لێهاتوویی و زیرەکی و زانیاریە زۆرەکانی، والی ڕێزی زۆری لێ دەگرت، لە خۆی نێزیك کردەوە، وەك عەباس عەزاوی دەڵێ: "مەلای خەتێ نامەیەکی پێشکەش بە (داود پاشا) کردبوو لە زانستەکانی ئیلاهیدا...لەو کاتانەدا زانایەکی زۆری کورد لە بەغداد کۆبوونەوە، بە هۆی قوتابخانە ناودارەکەی شێخ عەبدولقادری گەیلانیەوە، (داود پاشا) پێش ئەوەی ببێتە والی بەغداد قوتابی بووە لە قوتابخانەی گەیلانی، هەر لەو کاتەوە زۆربەی زانا کوردەکانی ناسیوەو، دۆستایەتیو خۆشەویستیان بووە، کاتێکیش کە دەبێتە والی بەغداد، ئەو دۆستانە لە خۆی نێزیك دەکاتەوەو ڕێزیان دەگریو یاریدەی

---

[٣١] لەسەردانێکماندا سالّی ١٩٩٥ دەستەی بالاّی کۆمەڵەی نووسەرانی ئیسلامی کوردستان بۆ ناوچەی سۆران سەرمان لەچەند ئەدیبو ڕۆشنبیرو زانای ناوچەکەدا کەمامۆستا مەلا سەعیدی ڕدحمەتیش یەکێکبوو لەوانە، کەچەند دەستنووسێکی ئیبن ئادەمی پێ نیشانداینو باسی زۆری ئەو زانا ناودارەی کوردی بۆ کردین و قسەکانیانم تۆمار کرد.

زۆریان دەداو کار ئاسانیان بۆ دەکاتو باری گوزەرانیان خۆش دەکات، هەتا کاری زانستیو ئاینیان بە ئاسانی بۆ بکریٚ...لە بەرئەوە (داود پاشا) لە باتی ئەوەی کاتەکانی بەگۆرانیو نوکتەو رابواردنەوە بەخت بکات، هەمیشە دیوەخانی گەرم بووە بە کۆری زاناو زانست گۆرینەوە، لەو لاشەوە میرنشینە کوردەکان و هەریمی بەغداد، کە زۆر جار سەر بەخۆ بووە و، کوردو بەغداد هەمیشە دوژمنی دەولەتی عوسمانی بوون، زۆر جار بەرژەوەندیان لە دژی عوسمانی یەکی دەگرتەوە، بەلام خەلکی دیٚن ئەم بەرژەوەندیە کە لە سەردەمیکی دوور لەم سەردەمەی ئیمەدا کراوە، ئەم پەیوەندییە دەبەنەوە بۆ شتی خراپو، لیکدانەوەی نابەجیو، هەرچی فیتنەیەك لە ناوچەکەدا روویدابیٚ دەیخەنە ملی زانا ئاینیەکان... کە بە مەرجیٚ داود پاشا، یەکەم دوژمنی سەر سەختی عوسمانیەکان بووەو، لە گەلٚ میر موحەمەدی رواندوز دا دۆست دەبن، رەنگە بە پیچەوانەوە مەلای خەتیٚ هەوینی ئەو یاریدەو دۆستایەتیە بوبیت...

بەو جۆرە وەکو هەموو کارە بەریوە بردنەکانی تر، مەلای خەتیٚ دەزگای فتوای میرنشینەکەی بەدەست بووە، جگە لەوە ـــ بە ناوـ راویژکاری (میر) بووە، کە دەبیٚ لە کاروبارەکاندا پرسو رای پیکرا بیت..!! بەلام لە میژوودا نیە جاریك پرسی پیکردبیت، چونکە (میر موحەمەد) چەندین دەزگاو دەستەو مەلبەندی بەریوەبردنی جۆراو جۆری بوە، رەنگە مەلای خەتیٚ لە چەند دەزگایەکدا ئەندام بووبیٚ...جگە لەوانە میر موحەمەد قسەی هەر قسەی خۆی بووە، بۆ زیاتر بەرچاو رۆشنی دەبیٚ پرسو رای زۆری بەدەزگاکان کردبیٚ، بەلام هەر ئەوەی دەکرد کە خۆی نیەتی لیهینابوو، هەرچی لە بەرژەوەندی خۆی بوایە، داوای دەکرد بە شەرعی خوا فتوای موفتی بۆ دەستەبەر بکریت، لە بەر توندوتیژی بەرامبەر بە خەلك، ناوچەکەی لە هەموو ناوچەکانی دی عیراقو عوسمانی هیمنو ئارامتر بوو، سوپایەکی مۆدیرن و زۆر پرچەکی هەبوو، لە هیزی میرنشینیکی نە دەکرد، وەك بلییٚ نیازی گەورەتری پیی هەبوو، تەنها هیزی تایبەتی پاراستنی خۆی، (سیٚهەزار) چەکدار بوو،

ژمارەی هەموو سوپاکەی (پەنجا) هەزار دەبوو، زیاتر لە نیوەیان مانگانەیان هەبوو[٣٢]، پەلاماری دیّی (برا دۆستی) داو ژن‌و منداڵی کوشتن، (قەڵای ئەلۆس) ی گرت‌و گەورەو بچووکی خەڵکەکەی لە ناوبردن، پەلاماری (مەرگەوەڕ و شنۆ) ی داو گرتی، دراوسێکانی ترسان، بە جۆرێك (هەریر و خۆشناوەتی) خۆیان دابەدەستەوە، ناوچەی (زرێبار) ناچار بون بیّ شەڕ گیرا، بە سەعاتێك (هەولێر) ی گرت [٣٣].

بۆ پەیداکردنی خواردەمەنی پەلاماری دەشتەکانی (ئاڵتوون کۆپری) دا کە بە گەنم بە ناوبانگ بوو، پەلاماری هۆزە عەرەبەکانی (جەباری) و (تائی) داو شێخەکەیانی گرت، هەوای گرتنی (کەرکوك) دابووی لە کەللەی، بەڵام چونکە (ئێران) هێرشی هێنابوویە سەر (سلێمانی) وازی هێنا، مشتی خۆش کردبوو لە میرنشینەکانی (بادینان‌و هەکاری‌و بۆتان‌و یەزیدیان)، بەڵام نەیدەزانی چ هەلێك بقۆسێتەوە بۆ پەلاماردان‌و خستنە ژێر باری خۆی، بەڵام ئەوەی بۆ بیانوو بگەڕیّ زۆر زوو دەستی دەکەوێت، بە تایبەت کە (عوسمانی) یەکان تەواو لاواز بوو بوون، لە ناوچەکاندا نرخیان نەمابوو، لە زۆر جێگە پاشەکشەیان کردبوو، جگە لەوە (موحەمەد عەلی پاشای میسر) جەنگێکی لە کۆڵ عوسمانیەکان کردبوویەوەو داوای پاداشتی لە (ئەستەمبوڵ) و (بابی عالی) دەکرد، ئەویش شتێکی کەمی دایە کە دورگەی (کریت) بوو، (موحەمەد علی) رازی نەبوو، دەیگوت دەبیّ (ولآتی شام) م بدەیتیّ، (ئاستانە) نەیدا، ئەویش پەلاماری (شام) ی داو گرتی‌و نامەی بۆ (میر محمد میری سۆران) نووسی کە ئەویش هەوڵ بدات بەشی خۆی پچڕیّ‌و، کیانێکی کوردی دروست بکات، ئەمانە هەموو لە لایەك و بیانووی وا گرنگ دروست ناکات ئەو مجازەفە خەتەرناکە ئەنجام بدات، مادام میرەکانی (بادینان‌و هەکاری) رازی نەبن‌و یاریدەی نەدەن...(داود پاشا) والی بەغدادیش ئەم بیرکردنەوانەی پیّ

---

[٣٢] کوردەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی . ل١٥٨.

[٣٣] بابان سۆران بۆتان . دکتۆر کاوس قەفتان . ل ٤٥ بغداد ١٩٨٥.

خۆشبوو، ئەویش خۆی لەو پرۆژەیەدا گرێ دابوو، کە هەرسێ لا لە سەری بوون کە (میسرو شام) و (میر محمدی سۆران) و بەغداد پێکەوە کارێك بکەن و خۆیان لە دەوڵەتی عوسمانی جوێ بکەنەوە...!!!!

# پەلاماری میرنشینەکانی بادینان و یەزیدیان و هەکاری

ئەو سەرکەوتنە سەرەتاییانە میر محمدی لەخۆ بایی‌کرد، دەستیکردە زیاتر خۆسازدان و پێکهێنانی جبەخانە، بۆ پێشخستنی تۆپخانە وەستایەکی لە شاری (ورمیٚ)وە هێنا ناوی (خان گیلدی) بوو، ناوچەیەکی پڕ ئاسنی گرت و گواستیەوە رەواندوز و لوولە تۆپی دادەڕشت و گوللە تۆپی بۆ دروست دەکرد، ساڵی (١٨٢٤ز) لە (گەڕەکی کاوکۆلاٚن) لە (رەواندوز) کارگەی شیرو تیر خەنجەرو تفەنگ و لوولە تۆپ و زێڕینگەری و دارتاشی و ڕەوڕەوەی تۆپی دامەزراند[٣٤]، سەربازو پۆلیس و پاسەوان هەریەکە شێوازی جۆری بەرگی لە بەرکردنیان جیاوازبوو، ساڵی (١٨٢٦ز) (بانگی ئازادی) بلندکرد، جاری سەربەخۆیی لێدا، کەهەر لە زووەوە خولیای سەربەخۆیی لە سەردابوو[٣٥]، خۆی ناونا (ئەمیر مەنسور)، دەوڵەتی عوسمانی و ئێران لێی ترسان، سوڵتانی عوسمانی روتبەی (میری میران) ی پیٚ بەخشی، ئێرانیش دانی نا بە سەربەخۆیی میرنشینەکەیدا[٣٦]، بەلاٚم لە ژێرەوە بابان و ئێران لە دژی (میر محمدو داود پاشای) والی بەغداد رێکەوتن[٣٧]، داود پاشا ئەو سەرکەوتنانەی میر محمدی پێخۆش بوو، دەستەو دیاریشی بۆ ناردو نازناوی (پاشا)ی پێبەخشی[٣٨] (خانی موکری و خانی چاری (چهری)و خانی هەکاری) یەك لە دوای یەك پیرۆزنامەیان بۆ هەنارد، (والی موسلٚ ) کەوتە ترسەوە[٣٩].

---

[٣٤] مێژووی میرانی سۆران . موکریانی . ل ٤٨

[٣٥] مێژووی نەتەوەی کورد لەکۆنەوە تا ئەمڕۆ . سالح قەفتان . ل ٢٩٨ بغداد . ١٩٦٩.

[٣٦] بابان سۆران بۆتان . دکتۆر کاوس قەفتان . ل٥١.

[٣٧] تأريخ العراق الحديث . دكتور عبدالعزيز نوار . ص١٣٢، قاهيرة ١٩٦٨.

[٣٨] مێژووی گەلی کورد لەکۆنەوە تا ئەمڕۆ . ل ٢٩٨.

[٣٩] کوردەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی . ل ١٥٤.

ئەم هەموو پیرۆزبایی‌و دڵخۆش کردنانە بەلای خۆیەوە میر محمد دڵخۆش بکات‌و, وەك (بەغدادو موسڵ‌و بابان‌و بادینان) خۆشبەختی بۆ گەلەکەی دابین بکات‌و بارودۆخی باشتریان بۆساز بکات، بەڵام زیاتر لە خۆی بایی‌دەبوو، هێزەکەی لا گەورە دەبوو، چاوی لە فراوانبوونی زیاتر بوو، بە تایبەت میرنشینی دەوڵەمەندی بۆتان‌و بادینان‌و هەکاری‌و یەزیدیان, کە هەر چواریان میرو میرنشینی کورد بوون, ئەو لە باتی ئەوەی بیان هێنێتە ناو هاوپەیمانیەکەی خۆی بەغدادوە دژی عوسمانی, کەچی دەیویست بە هەر شێوازێك بووە دەبیٚ بیانگاتیٚ...

لەم کاتانەدا ڕووداوێك ڕوویداو هەلێکی بۆ هاتە پێش, لە نێوان یەزیدیەکان‌و (خێڵی مزروی) ناومیرنشینی بادینانداڕووداوێك ڕوویدا ... زیاتر لە چوار سەد ساڵ بوو, کێشەی نێوان یەزیدیەکان‌و میرنشینە کوردیەکانی تری ئەو ناوە بەردەوام بوە، چەندین جار داویانە بە یەکدا, خوێنی زۆری لیٚ کەوتوەتەوە, ئەمە جگە لەو کێشانەی کە یەزدیەکان هەیانبوو لە گەڵ هەرێمی موسڵ‌و بەغدادو دەوڵەتیٚ عوسمانیدا، چونکە یەزیدی کەمینەیەکی غەیرە دینی ئەو ناوچەیە بوون, بۆ پاراستنی خۆیان‌و بەرژەوەندی کاروباریان, هەر جارە دەیاندایە پاڵ لایەك دژ بە لاکەی تر، لەبەر ئەو ژیانە دوو فاقیەی کە بە درێژایی مێژوو دەیان گوزەراند, چەندین جار تووشی گرفت بوون‌و, شەڕی ناڕەوایان بۆ خۆیان حەڵاڵ کردوە، بەتایبەت کە هێزەکانی ناوچەکەش دەیانزانی ئاسان بە دەستەوە دێن, بەکاریان دەهێنان[٤٠] وایان دەکرد کە چەندین جار زانا بەرزو موفتیەکانی میرنشینە کوردەکانیان، یان (شێخ الاسلام)ی ناوچە کوردیەکانیان والێکردوە, کە فتوای جەنگیان لە دژ دەربکەن‌و, شەڕی قورسی لیٚ بکەوێتەوە، هەر وەکو فتواکانی (شێخ الاسلام ئەبو سعودی عەمادی ٨٩٦ ــ ٩٨٢ کۆچی)، (فتوای شێخ عەبدولای مودەڕسی ربکی ١٠٦٠ ــ ١١٥٩ کۆچی) و (مەلا حەسەنی

---

[٤٠] الیزیدیة . صدیق دملوجي . ص٤٣٤.

شيفكی) كە لە هەموو فتواكان زياتر خەڵكی هاندەدا لە دژی یەزيديان...بە جۆرێك كە ڕێگەی دابەزينيان بۆ دەشتەكانيان لێدەگرتن و دێهاتيان تالأن دەكردنو جارێكيان گۆڕی (شێخ عودەی) يان دەرهێناو بۆماوەی نۆ مانگ ڕێگەی زيارەتيان لێگرتن[٤١].

تازەترين لێدانی یەزيديان ئەو هێرشە سەختە بوو كە مير محمدی ڕەواندوزی بە هەڵو بيانوويەك كرديە سەريانو نزيكەی سەد هەزاری لێ لە ناوبردن ...!!

دەبێ هۆی قەتڵ و عامی یەزيديان چی بووبێ..؟ چ ركێك ئەوكارەی كردبێ...؟

بەرای من، سێ هۆ كاريگەريان هەبوو لە سەر مير محمد، كە ئەوەندە خێراو توندو شێتگيرانە ئەو پەلامارانە بدات كە هيچ پێويستی بەو سەختگيريەش نە دەكرد...

يەكەم: ڕووداوێكی مێژوويی كۆنە، وەكو پێشتر وتم هێزە ناوچەييەكان بەكاريان دەهێنا، ئەوەبوو كاتێك (مير عيزەدين شێر) دەبێتە ميری سۆران، لە ساڵی (١٥٣٤ز) دا سوڵتانی عوسمانی (سلێمانی قانونی) دوای گرتنی بەغداد دێتە هەولێر، مير عيزەدين پێشوازی گەرمی لێدەكات، بەڵام سوڵتان دەيكوژێتو هەولێرو ميرنشينی سۆران دەداتە دەستی ميری یەزيديان (مير حوسەين بەگی داسنەيی یەزيدی)، مەبەستی سوڵتان ئەوەيە تۆوی فيتنە لە نێو كورداندا بەدوو ڕێبازی جيا بنێتەوە. ئەمە ماوەيەك دەخايەنێت، لە ناوچەی سۆران (مير سەيفەدينی كوڕی مير حسين كوڕی پير بداغی سۆرانی) دەسەڵات پەيدادەكاتو چەند شەڕێكی قورس لە گەڵ داسنەييە یەزيديەكان دەكات، ڕاويان دەنێو هەولێريان لێ پاك دەكاتەوە، بەڵام سوڵتانی عوسمانی بە فێڵ (مير سەيفەدين) بانگ دەكاتە ئاستانە (ئەستەمبوڵ) بۆ وتوێژو دەيكوژێت[٤٢].

---

[٤١] امارة بهدينان . صديق الدملوجي . ص٤١. الموصل ١٩٥٢.

[٤٢] مێژووی ميرانی سۆران . موكريانی . ل٩ . شەرەفنامە . پەراوێز. ل ٤٩٢

دوای ئەمە چەند شەڕێکی تری نێوان سۆران و یەزیدیان روو دەدات, کە هەر چەند تاوان هی عوسمانیەکان بووە، بەلاّم دەبوایە یەزیدیەکانیش ژێر بونایە, بە ناوچەی دەولەمەندی خۆیان رازی بوونایەو, هەنگاوی وا گەورەیان نەنایە, کە ئەوان پێچەوانەی ئاینی ئیسلامیان هەیەو, هەمیشە ئەو هۆیە لە بەردەمدایە بۆ هەڵگیرساندنی شەڕی مەزهەب گەرایی ناوخۆی نێوان کوردان, کە هەمیشە ئاواتی ئێرانی سەفەوی و عوسمانیە تورکەکان بوە ...میر محمد (پاشا کۆرە) بۆ هەلێك دەگەڕا تۆڵەی باپیرانی لە یەزیدیان بکاتەوە ...

هۆی دووەم: ئەوە بوو کە میری سۆران (میر محمد) لەو پەڕی نەشئەی دەسەلاّت و سوپادا بوو،ەنگ و باسی خۆی بیستبوو, بەڕەوای نەدەبینی جگە خۆی, میرێکی تر لە ناوچەکەدا دەسەلاّتی هەبیّ و, هەلی رۆژگاریش ئەوەی دەخواست کە بە کەیفی خۆی پەل بلاّوبکاتەوەو, ترسی هیچ لایەکی نەبێت و, تەراتێن بە سۆپا تازە نەفەسەکەیەوە بکات.

هۆی سێیەم : بریتی‌یە لەو هەلەی کەمیر بۆی دەگەڕاو زۆر ئاسان چنگی کەوت، ئەویش بەم جۆرە بوو: مزوریەکان خێڵێکی دامەزراوو خاوەن زانای بەرزو کەسایەتی چاکە خواز بوون لەمیرنشینی بادیناندا، میرە بادینیەکان رێزی زۆریان لێدەگرتن و زۆرجار فرمانی گەورەیان لە ئەستۆ دادەنان، بەلاّم دوا میرەکانی بادینان, کە هەمیشە خۆیان بە شتی پڕو پووچ و بیّ‌نرخەوە خەریك دەکردو, لە رێچکەی پێشینانیان لایاندابوو، نرخی موزریەکانیشیان نەدەزانی و زۆرجار دەیانویست لە کەسایەتیان کەم بکەنەوەو, دەترسان خەڵکی زیاتر مەیلیان بداتیّ و, دەسەلاّتیان زیاد بکات و, ریّ لە دوا میرەکانی بادینان بگرن، لەبەر ئەو لادانەی میرە بادینیەکان کە هەمیشە خەریکی خۆشی خۆیان و رابواردن بوون، مزورەکان گوێڕایەڵیان نەدەکردن، چونکە هەستیان کردبوو لە باتی ئەوەی مەیل بە کەسایتیەکانی ناو میرنشینی بادینان بدەن، ژێر بەژێر رێکەوتن و کاری نهێنیان لە گەڵ یەزیدیەکان دەکرد، رەنگە ئەو رێکەوتنە لە ترسی مزوریەکان بووبێت، هەر بۆیە نێوانی

مزوریـەکانو یەزیدیـەکان تـەواو ئـاڵۆز بـوو، مـیرە بادینیـەکان لـەو کـارەدا پشـتگیری مـیرە یەزیدیـەکان بـوون، کـە لـەوەدابوو بتەقێتـەوە، یەزیدیـەکان هەمیشـە لـە بۆسـەدابوون کـە دەسـتێك بهێـنن بەمزوریەکانـداو, دڵـی میرانـی بادینی پێخۆش بکەن، بەڵام سەرەك هۆزی مزوری هەستی دەکرد کە ئەمە وا بڕوات کاری خراپی لێدەکەوێتەوە، بۆیە لە دڵەوە حەزی دەکرد ئەو ناکۆکیـە یـــەکلا بکاتـــەوە، (ســـدیق دەمـــەلوجی) نوســـەر باســـەکە بـــەجۆرێك دەهێنێتەوە...[٤٣] دەیـەوێ بڵـێ کە میری یەزیدیان داوای ڕێکەوتنی کردوە، بەڵام راستیەکەی بەم جۆرەیە:

لـە نێـوان (عـەلی ئاغـای باڵـەتی) سـەرۆکی هـۆزی مزوریـانو (عـەلی بـەگ) ئـەمیری یەزیـدیان دوژمنایـەتی هـەبوو، (ئیسـماعیل بـەگ) حـاکمی عـەقرە (ئـاکریٚ) بـەوەیزانی، کەوتـە نێوانیـانو ڕێکیخسـتن، لـە گـەڵ (عـەلی بـەگ) ی یەزیـدی چـوو بـۆ لای (عـەلی ئاغـای باڵـەتی مـزوری)و دانیشـتنێکی خۆشـیان ئەنجامـدا، ئـەنجا داوای لـە (عـەلی ئاغـای مـزوری) کـرد کـە لـە هەلێکدا وەڵامـی سەردانەکەی بداتەوەو, بچێت بۆ لای (عەلی بـەگی ئـەمیری یەزیدیان)، ئـەویش رازی بوو...[٤٤]

عەلی بەگی یەزیدی لە ئاهـەنگی منداڵەکەیدا زۆر کەسـی دەعوەت کردبوو، دەعوەتنامەشی نارد بۆ (عەلی ئاغای باڵەتی مزوری) کە بەشداری ئەو ئاهەنگە بکـات لـە شارۆچـکەی (بـاعزەرە) ..عـەلی ئاغـای باڵـەتیش بەدڵخۆشـیەوەو بـۆ ئـاوکردن بـە ئـاگردا کەسـی وای لـە گـەڵ خـۆی نـەبرد, جگـە (٣) کـەس لـە نزیکەکانیو لەو ئاهەنگەی یەزیدیاندا بەشداری کرد[٤٥].

---

[٤٣] امارە بهدینان ل٤٣

[٤٤] الاكراد في بهدينان ..انور المائي . الطبعة الثانية . ص١٤٧، ١٩٩٩ دهۆك

[٤٥] امارە بهدينان . ل٤٤

ئەمیری بادینان ئەو رێکەوتن و سەردانانەی پێناخۆش دەبێ. وا گومان دەبات, ئەگەر ئەو دوو سەرۆکە رێك بکەون جێ پێی میرانی بادینان لەق دەبێ و, ناتوانن بە کەیفی خۆیان پێ رابکێشن. هەر بۆیە (سەعید پاشا) میری بادینان قەناعەتی بە ئەمیری یەزیدیان کرد, کە بە نهێنی (عەلی ئاغای مزوری) بکوژێ, هەر شەو لە ماڵی ئەمیری یەزیدیان کوژرا[٤٦] ئەمیری یەزیدیان چل پیاوی لە ناودارانی یەزیدیان کۆکردەوە, هەموو پێکەوە (عەلی ئاغای مزوری)و هاورێکانیان کوشت, هەتا خوێنەکەی دابەش ببێ و کەس خۆی لە ئەنجامەکەی نەدزێتەوە ... سدیق دەمەلۆجی دەڵێ:

بەوە میری یەزیدیان, لاپەرەیەکی سەر شۆری و عاری بۆ خۆی و هۆزەکەی لە خیانەت تۆمار کرد، لە ناوچوون و خوێن رشتنێکی بۆ خێڵەکەی حەلاڵ کرد، کە قورس بوو مرۆڤ بتوانێ ئەنجامەکەی دیاری بکات, یەزیدیان وەك دورگەیەکی بچوك, لە ناو دەریایەکی بێپەی لە موسوڵمانانا دەژیان, گەر موسوڵمانان خراپ بونایە ئەوان نەیان دەتوانی هەتا ئەمڕۆ بەو ئازادیە بمێننەوە, دەبوو هێندەی سنوری خۆیان پێیان رابکێشایە. نەك بە دەست ئەملاو ئەولاوە گەمەیان پێ بکرێت. دەبوو تێبگەیشتنایە, کە ئەو وەعدو پەیمانانەی کە پێیان دەدرا لە بەر خۆشەویستیان نەبوو, بەڵکو بۆ ئەوەبوو لە گەڵ برا کوردەکانیان بە شەریان بدەن, بەلام مەخابن..

(مەلا یەحیای مزوری) کە یەکێك بوو لە رۆشنبیرو دانشمەندە مەزنەکانی سەردەمی خۆی، خاوەنی ئیرادەیەکی ئاسنین بوو، مەزنترین زانایانی چەرخی خۆی بوو، تێکەڵی میرو دەسەلاتدارانی ناوچەکەی کرد بوو، برازای (عەلی ئاغای مزوری باڵەتی) بوو، بە کوژرانی مامی و (سنجان ئاغا) ی کوری بە دەستی یەزیدیان، دنیای لە بەرچاو رەش بوو، شۆرشێك لە دڵیدا تاوی سەند، ویستی تۆڵە بکاتەوە، هەموو مزوریەکانی تاوداو خۆیان چەکدارکرد،

---

[٤٦] الاكراد في بهدينان . ل ١٤٨.

بەڵام حەزی کرد بە شێوەی رەسمی و لە سنووری میرنشینی بادینان‌دا تۆڵە بکاتەوە، چوو بۆلای (سەعید پاشا) ی میری بادینان و داوای تۆڵە سەندنەوەی کرد، بەڵام ئەمیر لۆمەی کردو وتی: چۆن مامت بڕوای کردوەو خۆی خستە دەستی ئەمیری یەزیدیان هەتا بەو دەردە چوو، مەلا یەحیا هەستیکرد کە میر ئەو کۆس کەوتن و کوژرانەی پێناخۆش نییە...ئەنجا مەلا یەحیا چوو بۆ لای (ئیسماعیل پاشا) ی حاکمی عەقرەو داوای ڕاو بۆچوون و تۆڵەسەندنەوەی کرد، لای ئەویش هیچ پشتگیری و پەیمانێکی چنگ نەکەوت، هەستیکرد کە رەنگە ئەو داوە دەستی هەموو میرەکانی بادینانی تێدا بێت...لەم کاتە نارەحەتەدا هەواڵی بیست. کە یەکێك لە خادمەکانی (سەعید پاشا) میری بادینان تەعدای لە (مەلا عبدولرەحمانی کوڕی مەلا یەحیای مزوری) کردووەو پاشان کوشتوویەتی، مەلا یەحیا بەمەدا زانی کە ئەمە پلانێکە بۆ سووك و ڕیسواکردنی مزوریەکان بەسەرۆك و ئیمام و هۆزەکەیانەوە، لە بەرئەوە وتی: دەبێ تۆڵە لە میری بادینان و میرانی یەزیدیان پێکەوە بکرێتەوە، چونکە ناتوانن کاروباری خەڵکی بەڕێوەبەرن و دەستیان لە گەڵ دوژمنانی ئاین تێکەڵ کردوە...

مەلا یەحیا کە بەرزترین زانای ئەو کاتەی کوردستان بوو، لە عێراقیشدا وێنەی کەم بوو، کە سایەتیەکی ناسراوبوو، هاوڕێی داود پاشا والی بەغداد بوو، کاتی خۆی پێکەوە قوتابی بوون لە بەغداد، داود پاشا زۆر گرنگی دەدا بە شوێنی ئاین و پیاوانی ئاین، کەس نەبووە ئەوەندەی ئەو مزگەوت و قوتابخانەی ئاینی لە عێراقدا کردبێتەوە, ئەوەندەی ئەو دەست بڵاو بێ بۆ خزمەتی زانایان وپیاوی ئاینی و کەسایەتیە سۆفیەکان [٤٧] (بیطار) کە هاوچەرخی داود پاشا بووە ئەو قسە دەسەلمێنێت و دەڵێ: "داود پاشا دیاری زۆری دەبەخشی و دەستبڵاو بوو، کە دەسەڵاتی گرتە دەست,

---

[٤٧] گۆڤاری کاروان ژمارە. (٥٢) ١٩٨٧، عبدالفتاح علي یەحیا.

خەڵکێکی زۆر لە شێخ و زانایان و ناوداران دەهاتنە لای، چونکە ئەو نرخی دەزانین و زانیاریەکانی بە خەڵك دەناساندن، زۆر بەرز سەیری دەکردن و نیعمەتی بە سەردا دەڕژاندن..."[٤٨] داود پاشا خۆی پیاوێکی ئاینیی ڕێك و پێك بووە[٤٩].

دکتۆر عبدالعزیز نوار دەڵێ: "داود پاشا زانایەکی زۆری لە دەور کۆبووبووەوە بەتایبەت لە کوردەکان ..پارەو پولێکی زۆری بەدیاری دەدا بە کوردەکانی سەردەمی خۆی [٥٠] وە (٣٠) سی هەزار قەرزی (مەولانا خالیدی نەخشبەندی) دایەوە[٥١]...

زۆر کەس ئەو یارمەتی و گوێ دانە زاناو پیاوە ئاینیانە. بۆ هۆی سیاسی دەگێڕنەوە، کە گوایە داود پاشا بەکاری هێناون بۆ پڕوپاگەندەی خۆی و بەهێزکردنی دەسەڵاتی لە ناوچەکەدا..

مەلا یەحیای مزوری کە لە ئەمیرەکانی بادینان نائومێد بوو، روویکردە بەغداد بۆ لای هاوڕێی دێرین و خۆشەویستی، کە یاریدەی بدات، تۆڵەی ئەو ستەمە لە یەزیدیان و میرە بادینیەکان بکاتەوە... (داود پاشا) ش ڕێزی زۆری لێگرت و نامەیەکی پێدا نارد بۆ (میر محمد) ی رواندوز کە ئەو تۆڵەی بۆ بکاتەوە، چونکە ئەو کاتە ڕێکەوتنێك هەبوو لە نێوان (میر محمدی رواندوز) و (محمد عەلی پاشای میسر) و (داود پاشای بەغدا) کە پێکەوە یاریدەی یەکتر بدەن بۆ زیاتر سەربەخۆ بوون و، بەرەیەکیان دروست کرد لە دژی دەوڵەتی عوسمانی و ئێران و ئەوانەی لە گەڵیاندان ... (مەلا یەحیای مزوری) نامەی هەڵگرت و نەوەستا هەتا لای (میر محمد)، پاشا کوڕەی رواندوز (میر محمد) ڕێزێکی زۆری لێگرت و لە داواکەی کۆڵیەوە، ئەمە ئەو هەلەبوو کە میر محمد

---

[٤٨] کاروان (٥٢) ئەویش لە حلیة البشر في تاریخ القرن الثالث عشر. شیخ عبدالرزاق بیطار

[٤٩] هەمان سەرچاوە.

[٥٠] داود پاشا والي بغداد د.عبدالعزیز سلیمان نوار. ص ٣١٥ قاهره ١٩٦٧.

[٥١] کاروان ژمارە(٥٢) ئەویش لە حلیه البشر، ص ٦٠٣ ج١.

دەمێك بوو لە دووی دەگەڕا, هەتا داواکانی ناو ناخی خۆی لە فراوان کردنی سنوورو رسواکردنی میرەکانی تر لە کوردستاندا تیا بێنێتە دی... لەم کاتانەدا کە ئەمان لە رێکەوتنو ئامادەکردنی سوپاو نەخشەدانانداکبوون، (موسا بەگ) برای (سەعید پاشا میری بادینان) بە شوێن مەلا یەحیادا هات کە پێکەوە نەخشەیەك دابڕێژن دژی براکەی وبادینان، (موسا بەگ) دژی براکەی بوو، ناکۆکیان هەبوو لە سەر دەسەلاٚت، چونکە نزیك بە سالّی (١٨٢٥ز) سەعید پاشاو (ئیسماعیل) ی برای هێرشیان کردە سەر (موسا بەگو میران بەگی برایان) و هەردوکیان راونانو لە ناوچەی بادینان دەریان کردن... (موسا بەگ) ئەو هەلەی لە کیس نەداو دوا بە دوای (مەلا یەحیای مزوری) کە بەقسەی (ئەنوەر مائی) نووسەر (تاکە زانای مەزنی عێراقو ئیمامی سەردەمی خۆی بووە)[٥٢] خۆی گەیاندە رواندوز، میر محمد سوپاو جبەخانەی چاکی بۆ ئامادەکردن، کە دەڵێن زیاتر لە (٦٠) هەزار سەربازی پڕ بە چەكو تۆپ و تۆکمە بووە، میر محمد داوای فتوای کرد، هەندێك دەڵێن (مەلای خەتیٚ) فتوای جێبەجیٚ کردنی ئەو هێرشەی نەدا، چونکە تاوانی بادینانەکانی لا ئاشکرا نەبوو، هەندێکی دی دەڵێن، چونکە مەلا یەحیا زاناتر و ناودارتر بووە, پێویستی بە مەلای خەتیٚ نەبووە, هەرخۆی فتوای داوە، فتواکە بەم جۆرە بووە، یەکەم جار هێرش بکاتە سەر یەزیدیەکان لە سەر ئەو خیانەتو ستەمکاریەیان، لەوێدا ئەمیرەکانی بادینان ئەوە قبولٚ ناکەنو دێنە یاریدەی یەزیدیان، ئەوجا شەڕی بادینانیش حەلاٚلٚ دەبیٚ، چونکە یاریدەی کافر دەدەن[٥٣]..

میر محمد زۆر دڵخۆش بوو بەم فتوایە، چونکە لە هەلێکی واو پشتگیری کەسایەتیەکی وا دەگەڕا، کە هەم تۆڵەی باپیرانی سۆران لە یەزیدیەکان

---

[٥٢] الاكراد في بهدينان ـ ص١٤٨.

[٥٣] الاكراد في بادينان ـ ص١٤٩.

دەکاتەوە, هەم بە دەم برایەکی دینیەوە دەچێت و تۆڵەی ئەمانیش دەکاتەوە, خۆی ئامادە کرد بۆ هێرش‌و تۆڵە سەندنەوە، بە تایبەتتر کە (موسابەگ) برای میری بادینانیش هاتووەو داوای یارمەتی دەکات دژ بە میرنشینی بادینان...

(مەلا یەحیاو موسا بەگ) لەم حاڵەدا بەرژەوەندیان یەکی گرتەوە, بە گەرمی میر محەمەدیان هانداو خستیانە سەر هەوەسی گرتنی ئامێدی‌و چوونە سەر هۆزی یەزیدیانی‌داسنەیی، ئەنجا خۆشیان بە پەنهانی نامەو نوێنەریان بۆ هاودەنگ‌و ئاشنایان و هەوادارانی خۆیان نووسی‌و, داوای ئامادەبونی رۆژی پێویستی و تۆڵە سەندن کرد، گەورەو بچووکی خاکی بادینان بوونە هەواداری میری رواندوزو چاوەریٚی هاتنی بوون[٥٤].

---

[٥٤] مێژووی میرانی سۆران ـ موکریانی ـ ل٦٥.

## رووخانی هەردوو میرنشینی بادینان و یەزیدیان

میر محمدی ڕەواندوز شەست هەزار سەربازی كرد بە دوو بەشەوە، یەكیانیدا بە (ڕەسولْ بەگ) ی برایو، (موسا بەگی برای سەعید پاشا میری بادینان) ی كردە جێگری، كە ئەوان بەرەو بادینان بەرێبكەون .. سوپای دووەم بەسەركردایەتی خۆی رووی لە ناوچەی یەزیدیان كرد بۆ تۆڵەسەندنەوە ...ڕۆژی شەممە (١٥)ی ذي القعدة ١٢٤٨ لە زێ پەڕینەوە...بە (ڕەسول بەگ) ی برای وتبوو هەر كات میرانی بادینی هاتنە یاریدەی یەزیدیان، ئیتر شەڕكردنی ئەوانیش حەلاڵ دەبێ...میر محمد لە بەهاری (١٨٣٣ز) دا بە سوپاوە لە زێی بادینان لە ئاستی كەڵەكی (داسەنیان) پەڕینەوە، هەر لەوێدا (عەلی بەگی میری یەزیدیان) هەزاران چەكداری یەزیدی هێنابوویە بەردەمی میر محمد، دوای شەڕێكی قورس و دوو ڕۆژی، یەزیدیان دەشكێن و (عەلی بەگ) دەگیرێ و دەیهێننە ڕەواندوز و پاشان دەیكوژن[٥٥].

(سەعید پاشای میری بادینان) هێزێكی بە سەركردایەتی (یونس ئاغا) نارد بۆ یارمەتی یەزیدیان، (ئیسماعیل بەگ) یش حاكمی عەقرە هێزێكی هێنابوو بۆ یارمەتی یەزیدیان، بەلاَم پێش ئەوەی بگەنە مەیدانی جەنگ، یەزیدیان شكان و هەڵهاتبوون[٥٦]، هەردوو سوپای بادینانیش لە جەنگێكی دەستەو یەخەدا تێكشكان و ڕایانكرد.

ئیتر میر محمد داوای لە ڕەسولْ بەگی برای كرد، كە هێرش بكاتە سەر عەقرەو جەنگی بادینان دەست پێبكات...

لە دوای گیرانی هەردوو شارۆچكەی (شێخان و ئاكرێ) ڕژانی خوێنێكی زۆری یەزیدیان، یەزیدیەكان یەزیدیەكان بەردو موسلْ هەڵدێن. حاكمی موسلْ لە ترسی هێرشی میر محەمەدو لە بەر بێپەیمانی یەزیدیەكان، پردی سەر

---

[٥٥] كوردەكانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی . ل١٥٤.

[٥٦] الاكراد في بهدينان . ل١٤٩.

روباری دجلە دەڕوخێنێ‌و یەزیدیەکان لەو بەرەوە بێ بەرگری دەمێننەوە، میر محمد گەمارۆیان دەداو هەر هەموویان دەکوژێت، لەو شەڕانەدا نزیك بە (١٠٠) سەد هەزار یەزیدیی دەکوژرێ‌و، زۆریشیان هەڵدێن بەرەو شوێنانی دوور[٥٧]. بەلاّم گۆڤاری (لالش) هەموو کوشتارەکانی یەزیدی بە (٤٥٠٠) کەس مەزەندە دەکات[٥٨].

لە بەر بەهێزی قەلاّو شورەی موسڵ، میر محمد وازی هێناو هەموو قورسایی سەربازی و هێرشیان کردە سەر ناوچەو بەرەی جەنگی بادینان، دوای (عەقرە) (زێبار) گیرا، پاشان هێرش کرایە سەر شاری عەمادیەی پایتەختی بادینان، چونکە مەلا یەحیای مزوری نفوزی ئاینی بەهێزی لەو هەرێمەدا هەبوو، ئەوە ڕێخۆشکەر بوو بۆ میر محمد، هۆزەکان هەموو بەگوێیان دەکرد، ئەو لە فتواکەی دا وتبوی حەرامە هەر کەس یاریدەی میرەکانی بادینان بدات کە ڕێیان لێ ون بوەو لەحوکمی شەریعەت دەرچوون، ئەو فتوایە کاری خۆی بە جۆرێك کرد، خەڵکە کە سەعید پاشایان وەك کەسێکی دەرچوو لادەر و بێبڕوا سەیر دەکرد[٥٩].

محمد پاشا ماوەیەکی باش گەمارۆی (ئامێد)ی‌دا، هونەری جەنگی زۆری گۆڕی بەلاّم چاری نەبوو، هەتا چەند کەسێکی بە نهێنی ناردە قەلاّو ساڵی (١٨٣٤ز) شار گیرا، (موسا پاشا) ی برای کردە ئەمیری ئامێدی‌و بادینان، ئەنجا میر محمد رووی‌کردە زاخۆ، ئەویشی گرت، پاشان دەستی کرد بە ڕێکخستنی کاروباری ئیداری ناوچەکە، هێمنی‌و ئاسایش باڵی بەسەر ناوچەکەدا کێشا، وەکو (میجر لونگریك) دەڵێ: لە بەڕێوەبردندا وێنەی نەبووە[٦٠] ...هەندێ مێژوونوس پێیوایە ئەو ئاسایشە لە ترسابووە چونکە

---

[٥٧] گۆڤاری کاروان ژمارە ٢٢ ساڵی ١٩٨٦.

[٥٨] مجلة لالش . الثقافية الصادرة عن مركز لالش في اوروبا . العدد(٥).

[٥٩] الأكراد في بهدينان . ل ١٥٠

[٦٠] اربعة قرون من تاريخ العراق الحديث . ترجمة ستيفن همسلي لونكريك . ترجمة جعفر الخياط . بغداد ص٢٤٣

خەڵکی لە تۆڵە سەختەکانی میر محەمەد ترساوە و بەچەترسێن بوە, پاشان سوپای ڕێکخستەوە, ڕوویکردە ناوچەی (جزیرەو حەسەنکیفو ئازیزان) و زۆرێك لەو ناچانە کەوتە دەستی میر محەمەد، هەردوو قەڵای (ماردینو نسێبین) لە ئەمارەتی بۆتان کەوتنە خەتەرەوە...ئەم هەنگاوە نەك بەدرخانیەکانو میرنشینی بۆتان، بەڵکو دەوڵەتی عوسمانی خستە مەترسیو بیر کردنەوەو باسو خواسەوە، تەنانەت لەئاستانە (ئەستەمبوڵ) باس باسی ئەو هێرشە نزیکانەبوو, کە ئاستانەی هێنابویە لەرزە..

هەتا ساڵی ١٨٣٦ دەسەڵاتی لەو سنورە فراوانەدا مایەوە [٦١]، سنوری گەیشتە نێوان موسڵو میرنشینی بۆتانو شنۆو لاریجانو میرنشینی بابانو خوار کەرکوك.

لێرەوە (حسێن حوزنی موکریانی), چەند هەواڵێکی پەیوەندی میری سۆران (پاشا کوێرە) بە (محمد علی پاشا) ی میسرەوە باس دەکات، کە بووەتە جیّی باسو خواسی مێژوونووسانو, هەتا ئێستەش بەڵگەنامەی بەهێز چنگ نەکەوتووە، موکریانی دەڵیّ " لە دوای گرتنی (ئامێدیو زاخۆو ژەنگار) ەوە پەیمانی یارمەتی پێکدیان گرێداوە کە سوپای محمد علی پاشا بەرەو (شام و سوریەو ئەدەنە) بچنە خوار، میر محەمەدیش (لای خۆیەوە) بەرەو (ماردینو دیاربەکر) لە شکرکێشی بکات، ئەو نامە گۆڕینەوانە لە مانگی تشرین (١٢٤٧ك)، بەرامبەر (١٨٣١ز) دابووە، لە مانگی مایس (١٨٣٢ز) دا میر محمد ئەو خاکانەی گرت کە دیاری کرابوو ...(ئیبراهیم پاشای کوڕی محمد علی پاشای میسر) کە سەرکردەی سوپای میسر بوو لە شام لە تەموزی (١٨٣٢ز) دا کە گەیشتە (حومص) قاقەزێکی بۆ میر محمد ناردو, لە دەوری موسڵ بە میر گەیشت[٦٢]" بەلاّم هەتا ئێستە لێکۆڵینەوەیەکی قووڵ لە ئەرشیفی دراوسێکانو ڕووداوەکانی ئەو

---

[٦١] مێژووی گەلی کورد لەکۆنەوە تا ئەمرۆ . ل٢٩٤.

[٦٢] مێژووی میرانی سۆران . ل٦٨

سـەردەمانەدا نـەکراوە، بـە تایبـەت ئەرشـیفی میسـرو شـامی ئـەو دەمانـەی هێرشەکانی تێدا کراوە...یان ئەو سەرچاوانەی کە دەڵێن ڕێکەوتنێکی سێ قۆڵی نێوان (میسرو بەغدادو میرمحمدی ڕواندوز) بووە, کە یاریدەی یەکتر بدەن بۆ جیابوونەوە لە دەوڵەتی عوسمانیو ڕاگەیاندنی سەربەخۆییان ..."
من وای بۆ دەچم کە ڕێکەوتنی لەو جۆرانە بووبێت، کارێکی لەو جۆرە میر محمدی هانداوە ئەو هەموو هەنگاوە دورانە بنێ و لە نێو ئەو دوژمنە گەورانەدا سەربەخۆیی ڕابگەیەنێ، ئەوە لە لایەك، لە لایەکی ترەوە یەکگرتنی (ئێرانو ڕووسو عوسمانیو بەریتانیا) لە سەریەك قسە، بۆ نەهێشتنی دەسەلاتی (میر محمدو بەغدادو میسر) لە ناوچەکەدا, نیگاهی هەوالی ڕێکەوتنێکی لەو جۆرە دەدەن...

## نەخشەی عوسمانیەکان بۆ لەناوبردنی میر موحەمەدو داود پاشاو دەسەلاٚتی موحەمەد عەلی پاشا لە شامدا

بە شایەتی زۆر لە میٚژوونووسان و نووسەران، رەواندوز لە سەردەمی خۆیدا بووبوو بە مەلبەندی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردی لە سیەکانی سەدەی هەژدەدا، بە فەزلٚ و ئەو گرنگییەی کە یارمەتی سەرکردە کوردەکانی دەدا, کە دەیانویست رزگاربن لە دەسەلاٚتی عوسمانی و شای ئیٚران...پاشان پەیوەندی کردن بە محمد علی پاشای والی میسر، میر محمد دەیویست و هەوڵیدەدا زالٚ ببیٚت بەسەر کوردستانداو, کوردستانیٚکی سەربەخۆ دابمەزریٚنیٚ، تیٚکۆشانەکانی رووسیش بە دژایەتی دەسەلاٚتی عوسمانیەکان بوو، کە سۆرانیش دەکەونە سنووری ئەوەوە [٦٣] میر محەمەد لە ئەمارەتەکەیدا بەزۆردارییەك یاسای سەپاندبوو، دادپەروەری بلاٚوبوو، زەبت و رەبتی لەوجۆرە باونەبوو لە ناوچەکەدا، بەلٚکو لە عیٚراقدا پشیٚوی باوبوو[٦٤] پاشا کۆرە هەر لە سەرەتای لاویەوە خولیای سەربەخۆیی لە سەردابوو[٦٥]، سەربەخۆیی ئامانجی هەرە گەورەی بوو، (سۆن) لەو رووەوە دەلٚیٚت: "چاوی لە سەربەرزی و سەرفرازی میللەتەکەی بوو"[٦٦].

ئەمانەو زۆری تر هۆبوون بۆ ئەوەی سولٚتانی عوسمانی بیر لە چارەسەریٚك بۆ فراوانخوازیەکانی میر محمد دابنیٚ...لە سەردەمی (سولٚتان محمودی دووەم ) دا (١٨٠٨ ـ ١٨٣٩ز) بریاریدا کە دەست بگریٚتەوە بەسەر هەموو بەشە لە دەستچووەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا، سەرەتا گرفتی گەورە چەکدارە ئنکشارییەکان بوو، لە ناوی بردو سوپایەکی نیزامی نویٚی لە جیٚی

---

[٦٣] کاروان. ژمارە ٥٢.

[٦٤] اربعة قرون من تأريخ العراق الحديث. ستيفن همسلي لونكريك. ترجمة جعفر الخياط. بغداد ص٣٤٢.

[٦٥] میٚژووی نەتەوەی کورد لەکۆنەوە تا ئەمرۆ. سالٚح قەفتان. ل٢٩٨ بغداد ١٩٦٩.

[٦٦] چەند لیٚکۆلٚینەوەیەك لەمیٚژووی بابان سۆران بۆتان. د.کاوس قەفتان. ل٥٠ بغداد ١٩٨٥.

دانا، هەتا مەرکەزیەت زاڵ بکات بە سەر ولایەتەکانیدا، چونکە زۆر ناوچە دابڕابوون و سەربەخۆییان ڕاگەیاندبوو گاڵتەیان بە بڕیاری ئاستانە دەهات، دواتر نەتەوە پەرستی لە ناوچەکەدا هەر لەوێوە سەری هەڵدا، لە موسڵ (والیە حەلیلیەکان)، جۆرە سەربەخۆییەکیان ڕاگەیاندبوو، لە بەغداش (داود پاشا) تەواو سەربەخۆ بووبوو، لە (محەمەرە بەنوکەعب و لەعەشایەری شەمەر جربا شێخ صفوکی فارسی) و لە کوردستانیش (میری سۆران) سەربەخۆییان ڕاگەیاندبوو، ئەمیرەکانی (بۆتان و هەکاری و بەدلیس) یش جۆرە سەربەخۆییەکیان هەبوو، دەسەلاتی داهاتووی عوسمانیش بەسرابوو بە پاشەرۆژی ئەو هێزانەوە ...

سەرکردایەتی عوسمانیەکان لەو دۆخەیان کۆڵیەوە. بڕیاریاندا بە هێرشێکی سەربازی توند ئەو کێشەیە چارە بکەن...دوای تاوتوێ کردنی قوڵ ئەو ئەرکەیان سپاردە (عەلی ڕەزای لاز)، چونکە ئەو لە هەموو والیەکان زیاتر شارەزاتر بوو بەناوخۆی عێراق و، کەسایەتی زۆری لە والی موسڵ و سەرکردەی مەمالیك و شێخی عەشایەر دەناسی، کە دوژمنی داودپاشا بوون، هەر بۆیە نازناوی (سەرعەسکەر) یان پێبەخشی[٦٧] (بابی عالی) هەموو داوایەکیان بۆ جێبەجێکردو شەش هەزار کیسەپارەیان دایە[٦٨] هەر لەوێوە فەرمانی فەرمانڕەوایی (بەغدادو حەڵەب و دیاربەکرو موسڵ) یان پێدا، کە جاران ئەو سنورە فراوانە بە چەند کەس دەدرا[٦٩]، (یەحیا پاشا) والی دیاربەکرو (عەلی شەفیق) والی ئەرزڕۆم کرانە بەر دەستی، زۆر سەرکردەو فەرمانبەری مەزنی پێدرا...

لە سەرەتای شوباتی (١٨٣١ن) ەوە (عەلی ڕەزا لاز) لە حەڵەبەوە بە (دە هەزار) سەربازەوە جوولا، (نۆ) تۆپی پێبوو، نە گەیشتە موسڵ، بوون بە (٢٠)

---

(٦٧) بغداد مدينة السلام. ريجارد كوك. ترجمة. مصطفى جواد وفؤاد جميل. ج٢ ص١٤٥ بغداد ١٩٦٧.

(٦٨) یەك کیسە زیو (٥٠٠) قورش بوو، یەك کیسە ئاڵتون (١٠) هەزار قورش بوو.

(٦٩) اربعة قورن من تأريخ العراق الحديث. ص٢٣١.

هەزار کەس، پەیمانی بە خەڵك دەدا کە تەنها کاری دوژمنایەتی کردنی (داودپاشا) یەو، گێڕانەوەی دەسەلاّتی مەرکەزیە، روویکردە بەغداد کە خەتەرترین سەربەخۆ خواز بوو، (داود پاشا) ش بەهێزبوو، بەلاّم لە بەختی عوسمانیەکان لە ناو شاری بەغداد دا نەخۆشی تاعون بلاّو بوو بوویەوەو خەڵکێکی زۆری کوشتبوو، جگە لەوەی رووباری دیجلە هەستابوو لافاوی کردبوو، (داود پاشا) گیردرابوو، هیچی بۆ نەکرا، سوپای عوسمانی بە ئاسانی چووە ناو شاری بەغداد.

ئەم کارە ناوی (عەلی رەزا) ی بەرزکردەوەو، پاڵنەربوو بۆ سوربوون لە سەر بەجێهێنانی کارەکانی تریش...بەمە پاڵپشتێکی مەزنی میر محمد لە لای چەپیەوە لەناو چوو، پاشان بۆ لە ناوبردنی میر محمدی رەواندوز ئەفسەرێکی غەیرە نیزامی هەڵبژارد بە ناوی (محمد ئینجە بیرقدار)و کردی بە والی شارەزوور ( واتە موسڵ و کەرکوك و سلیمانی)، ئەم ئەفسەرە بە دوژمنترین دوژمنی دەسەلاّتە کوردیە ناوچەییەکان دادەنرا[٧٠]، ئەو کاتە میرنشینی سۆران و بابان هەتا هەولێر و سلیمانی و کەرکوك بەشارەزوور ناودار بوو، (عەلی رەزا) دەترسا (بریقەدار) بتوانێ ناوچەکە بپارێزێ، چونکە میر محمد لێوەی نێزیك بوو، هەر بۆیە ساڵی (١٨٢٤ز) هەموو ناوچەکەی خستە سەر موسڵو، (بریقەدار) ی کردە والی، (بریقەدار) خۆی ئامادە کرد بۆ هێرش بردن بۆ سەر میر محمد، پێشەکی داوای ڕەشبگیری کرد لە خەڵکی موسڵ، بەلاّم نەهاتن بە دەمیەوە، هەر بۆیە هەڕەشەی کرد وتی شار دەدەمە بەر تۆپ ئەگەر وەلاّمی داوای عوسمانیی نەدەنەوە.[٧١]

'(عەلی رەزا) داوایکرد پەیوەندی بکەن بە سوپاوە، زۆر کەس لە ناودارو سەرەك هۆزەکان دوای کەوتن، ئەویش بە ناوبانگ بوو بە دەستبلاّوی و، خاوەن پارەو زەوی و دێهاتی بە دیاریی پێدەبەخشین، بەلاّم لە ناو ئەوانەدا

[٧٠] گۆڤاری کاروان ژمارە (٥٢) ئەویش لە (لونکریك ص٠ ٣٤) ی وەرگرتوە.

[٧١] تأريخ الموصل . سليمان الصايغ . ج١ص٣١٣ قاهرة.

چەند زانایەکی ئیسلامی وەڵامی نەدانەوە، شێخ نورەدین بریفکانی (١٧٩٠ ـ ١٨٥١ز) زانای ناوداری سەردەمی خۆی بوو, وەڵامی نەدایەوەو بە نوێنەری عەلی رەزای وت: (من هەر بۆ ئەوەی کەمێك لە دنیام بدەنێ لە گەڵ ستم کاران نابم) تیان دەبێ قسە بڵێی بە ئەمیری سۆران : (وتی هەرگیزو بە هیچ جۆرێ قسە ناڵێم بە ئەمیری سۆران...) عەلی رەزا پەیمانی پێدابوو کە (پانزە) دێهاتی ئاوداری بداتی گەر وەڵامی بداتەوە"[٧٢]، بەڵام هەڵوێستی ئەم و زۆر لە زانایان ئازایانەو مەردانە بوو...

(عەلی رەزا) سوپای (ئنکشاری) بەغدادی نارد بۆ یارمەتیدانی (بریقەدار) بۆ لێدانی شاری عەمادیە و میر محەمەد, دەوڵەتی عوسمانی دەیویست سوپای بە هێزی ئنکشاریەکانی لە کۆڵبێتەوە، چونکە سەربەخۆیی یان وەرگرتبوو، زۆر بە گوێی سوڵتانەکانیان نەدەکرد، پێشەکی هەموو رێگەکانی چوون بۆ رواندوزی گرت، هەموو دێهاتەکانی ئەو ناوەی سووتاند، میر محمد داوای لە حاکمی دهۆك و عەمادیە کرد کە بدەن لە سوپای بریقەدار، خۆیشی سوپایەکی نارد بۆ یارمەتیان، بریقەداریان لەنزیك زابی گەورە زۆر خراپ شکاند، سوپای عوسمانی جارێ تر خۆیان رێکخستەوە و هێرشیان هێنایەوە, بەڵام دیسان شکان بەشیان بوو...بریقەدار لە داخان زانای ئاینی زۆری گرت و لەسەر گردی گومەل (تل العرب) نزیك قەزای شێخان هەموویانی سەربڕی[٧٣]. کوردەکان ویستیان تۆڵە لە بریقەدار بکەنەوە، لە سەربازگەی موسڵ پەلاماریاندا بیکوژن، بەڵام رزگاری بوو[٧٤].

هەر لە سەرەتای ئەم نەخشە سەربازیەوە بەریتانیا ئاگاداربوو، بەرتانیا دەترسا کە دووهێزی تازە نەفەسی کوردیی لە رەواندوزو میسر جێی (پیاوە نەخۆشەکە) واتە دەوڵەتی عوسمانی بگرنەوە، محمد عەلی پاشای میسریش

[٧٢] الشيخ نورالدين البريفكاني . محمد احمد مصطفى الكزني ص٦٠، قاهرة ١٩٨٢.

[٧٣] تاريخ الموصل . ص٣١٠.

[٧٤] مێژووی میرانی سۆران . ل٦٣، حوزنی موکریانی.

لە بنەڕەتدا کوردە, خەڵکی شاری (دیاربەکر)ە, بە هۆی بازرگانی تووتنەوە لە گەڵ ماڵی باوکی چونەتە (ئەلبانیا) و لە شاری (قولە) نیشتەجیٚ بوون, بە ئەفسەری لە سوپای عوسمانیدا دەچێتە میسر, بۆ جەنگ دژی هێرشی فەرەنسی و, لە هەلێکدا دەبێتە والی و پاشای میسر[٧٥] بەریتانیا دەیزانی گەر پەلە نەکەن, ئەو دوو محمدە کوردە لە توانایاندا هەیە نەخشەی ناوچەکە لە بەرژەوەندییەکی تر بگۆڕن، چونکە ئەوە هێزی میر محمدی ڕەواندوزە کە ئاستانەی هێناوەتە لەرزە، محمد عەلی پاشای میسریش بە داوای سوڵتانی نەخۆشی عوسمانیی, دوو شۆڕشی لە (یۆنان و نیوە دوورگەی عەرەب) کوژاندوەتەوە, کە دژ بە دەسەلاتی عوسمانی هەڵگیرسابوو، عوسمانیەکانیش دوورگەی (کریت) یان بە دیاری پێشکەش کردوە. محەمەد عەلی پاشای میسر ڕازی نەبوو, داوای ولاتی شامی دەکرد، عوسمانیەکان نەیدایە، هەر بۆیە لە هەلمەتێکدا هەموو شامی گرت, لە هێزی میر محمدی رواندوز نێزیك بویەوە, کە دەتوانن پێکەوە کاری مەزنتر ئەنجام بدەن، بەریتانیا ئەو پیاوە نەخۆشە (عوسمانیەکان) لەو دوو هێزە تازە نەفەسە ڕاپەڕیوە پیٚ چاکترە، چونکە لای عوسمانیە بیٚ هێزەکان, مەرامەکان و بەرژەوەندییەکانی پارێزراوترە...وای بە چاکزانی بە فێڵ محمد علی پاشا بوەستێنیٚ و, بە شەڕ میر محمدی ڕەواندوز لە ناو ببات، هەتا محمد عەلی پاشا بمێنیٚ, وەرەقەی زەختی بەریتانیا دەبێت بۆ دژایەتی فەرەنساو عوسمانیەوە، هەتا عوسمانی نەبێتە ئاستەنگ لە سەر ڕێگەی هیندستان, کە ناسراوە بە (خط المیاه الامبراطوري)...

ئەوەبوو بەریتانیا هەر بە زۆر ڕێکەوتنێکی لە شاری (کوتاهیە)ی تورکیا پیٚ مۆرکردن, کە تیایدا میسرو عوسمانیەکان لە شام شەڕ بوەستێنن، ئەنجا بەریتانیا بە هۆی سیخوڕەکانیەوە لە سوریەو شام, هەستی تایفەگەری وروژاند لە دژی میسریە داگیرکەرەکان و, دوای چەند شەڕێکی خوێناوی ناوخۆیی دژ بە میسریەکان، سوپای میسر لە شام گەڕایەوە ...ئەنجا

---

[٧٥] گۆڤاری کاروان خولی ڕاپەڕین ژمارە (٨) ١٩٩٣، ئەحمەد باوەڕ.

بەریتانیا نەخشەیەکی تری دارِشت، بۆ لە ناوبردنی ئەوانەی کە دەستیان لەو ئاژاوانەدا هەبوو، بەلاّم میر محمد ئەوەی نەبردە سەرخۆی، ماوەیەك شەڕ وەستا، هەتا نەخشەیەکی جەهەنەمی دابرێژن بۆ میر محمدو میرنشینە کوردەکانی تر، ئەو ماوەیە میر محمدی بێتاقەت کرد، لە باتی ئەوەی چاودێری دۆخەکە بکاتو، پاڵپشتو دۆست بۆ ئەو فراوانخوازیەی پەیدا بکات، بەلاّم بەداخەوە لە خۆی بایی بوو، پەلاماری ناوچەکانی (لاهیجانو موکریان) ی داو ساڵی (١٨٣٤ز) زاینی سوپای (فەتح) شای ئێرانی شکاند، دوژمنێکی دیکەی بۆ خۆی زیاد کرد، کاتێك وەبیر خۆی هاتەوە چی بۆ تەنراوە، هەر زۆر زوو لە گەڵ ئێران رێکەوت و، بە زیانێکی زۆرەوە کشایەوەو. ناوچەکانی ئێرانی جێهێشت...

عوسمانیەکان ترسان جەنگیان لە گەڵ میسر لە خاکی شامدا هەڵبداتەوە، لەبەر ئەوە بۆ پتەوکردنی پشتی خۆی سەربازگەیەکیان لە موسڵ دامەزراند، چونکە رێکەوتنی (کۆتاهیە) هودنەیەکی کاتیبوو..

پاشان عوسمانیەکان نەخشەیەکی تریان دارِشت، کە تایبەت بێت بە لەناوبردنی میر محمدی رەواندوز ، ئیتر لێرەدا کاری (عەلی رەزا) تەواو بوو، بەغدادی گێڕایەوە ژێر دەسەلاّتی عوسمانی، بزانین بۆ میرنشینی سۆران چی دەکات..؟

عوسمانیەکان ( محمد رەشید پاشا ) ی (سەدری ئەعزەمی پێشوو) یان بۆ یەکلا کردنەوەی کاری میر محەمەدی سۆران دانا، محەمەد رەشید پاشا (والی سیواس) بوو، پێشتر لە جەنگی عوسمانی ـ میسری‌دا دیل کرابوو بەرەلاّ کرابوو، ساڵی (١٨٣٣ز) لە سەر ئەو بەندبونەی لە کار دەرکرا، ساڵی (١٨٣٤ز) کرایەوە بە (والی سیواس)، عوسمانیەکان (٤٠) چل هەزار سەربازیان دایە، ئەمە هەلێك بوو، بۆ ئەوەی جارێکی تر بڕوای سوڵتان بە دەست بهێنێتەوە، ئەگەر ئەم جارەش شکست بهێنێ، ئەوە بە یەکجاری لای سوڵتان تیا دەچێ، وەك زۆر سەرکردەی شکست خواردووی تر لە ناو

دەبریّت، لەبەر ئەوە زۆر وردو گرنگ كاری دەكردو هەنگاوی دەنا، لە هاوینی (١٨٣٤ز) دا بە چل هەزار سەربازەوە جوولاّ، ئەمیرە هەڵهاتوە كوردەكان, كە لە ترسی میر محمد رایانكردبوو بۆ موسڵ و ئەستەمبوڵ, كێبەركێیان بوو لە خۆ بردنە پێشەوە لای (رەشید پاشا)، عوسمانیەكان پلەی (سەر عەسكەر) یان دایە رەشید پاشای كەرجی واتە (سەرەك سوپای رۆژهەلاّت)، كە هەمان پلەی (عەلی رەزا) ی پێشوو بوو، چەند كوردێكی هەڵهاتوو، وەكو (محمد مەسرەف و محمود خۆشناوو بایەزید بەگی باپشتی) یاریدە دەری بوون، بەتایبەت (باپشتی) بووبوویە چاوساغی و, پەیوەندی نێوان رەشید پاشاو خێڵە كوردەكانی رێكدەخست[٧٦].

(فرانگیل) ی رۆژهەلاّتناس دەڵێ: "ولاّتە رۆژئاواییەكان نەك هەر راوێژكەری رەشید پاشا بوون، بەڵكو رێنیشاندەریشی بوون، بەریتانیا پسپۆری لە گەڵ لەشكرەكەی رەشید پاشا ناردبوو، هەتا نەخشەكە بیّ كەم و زیاد جێبەجیّ بكرێت و خاڵێك نەبیّ ئەوان سەری لێدەرنەكەن، دوو كەسی زیرەكی بەریتانی لەگەڵ بوو بەناوی (ئارگۆیە) پسپۆری بەرەی شەڕو، (پێتین) پسپۆری ئەندازیارێتی جەنگی، جگە لەمانەش چەند پزیشكێكی بێگانە لە لەشكرەكەی دابوون[٧٧]".

رەشید پاشا لە (سیڤاس) ەوە جوولاّ بەرەو (مەلاتیە)، پاشان بەرەو رۆژهەلاّتی ئەنادۆڵ رۆیشت, بەدەم رێگەوە, هەموو حیساباتی خۆی لە گەڵ سەرۆك و میرو هۆزە كوردەكان یەكلا كردەوە، مۆڵەتی سەربازەكانی دابوو چی دەكەن ئازادن، ئەوانیش بە دەم رێگەوە كاولكاری زۆریان دوای خۆیان جێهێشت، خراپیان بە خەڵكی (سعرت و ماردین و نسێبین و جزیرەو ئەتاك و موش و سنجار)كرد، كوردەكانیش بەرگریەكی سەخت و ناچارو شێتگیرانەیان

---

[٧٦] گۆڤاری كاروان ژمارە(٥٢) ١٩٨٧.

[٧٧] خەبات لەرێی كوردستاندا . خالفین . ل٦٥، ئەویش لەبیرەوەریەكانی (بارۆن رۆزین) وەریگرتوە كەبۆ وەزیری دەرەوەی روسی نووسیوە.

دەکرد، زۆریان لە سوپای عوسمانیی کوشت، ناوچەی ئەتاك سالی (١٨٣٤ن) مەلبەندی شۆڕشی کوردان بوو، رەشید پاشا (دە هەزار) سەربازی بۆ ناردن، زۆر دڕندانە هەموویانی لە ناوبرد, (رەجەب بەگی) سەرکردەیانی گرت و ناردی بۆ ئەستەمبوڵ، شاری (جزیرە) یان بە تۆپ بە سەر بەدرخانیەکاندا کاول کردو شارەکەی سووتاند، (جزیرە) پایتەختی میرنشینی بۆتان بوو[٧٨]، پاش ئەوە پەلاماری یەزیدییەکانیان دا (سێ لەسەر چوار) ی خەڵکەکەی لە شاخی سنجار کوشت و منداڵەکانیان بردن و, لە شارەکان دەیان فرۆشتن...[٧٩], هێزی عوسمانی هەر لەسەرەتاوە کەوتنە وێزەی یەزیدی و ئەرمەنیەکان، بە بیانووی ئەوەی کە هەمووجار دەیاندایە پاڵ سوپای (رووس) دژ بە عوسمانیەکان دەجەنگان، بە تایبەت لە شەڕەکانی سالی( ١٨٢٨و ١٨٢٩ن) ی نێوان رووس و عوسمانیدا، لە پشتەوە جاسووسیان بە سەر عوسمانیەکانەوە دەکردو زەرەری باشیان لە عوسمانی دەدا, چەند جارێك عوسمانیەکان میرنشینە کوردەکانیان هانداوە, یاخود پێکەوە داویانە لە یەزیدی و ئەرمەنیەکان، هەموو جاریش ئەو بیانوەیان دەکردە فێڵ, کە دەیانەوێ موسوڵمانیان بکەن..

(حسەین بەگ) لە جێی میری پێشوو, کە پاشا کوڕەی ڕەواندوز کوشتی کرایە میری یەزیدیان, کە ئەمجارە عوسمانیەکان هێرشیان هێنا, میرەکان گەلەکانیان جێهێشت و لە بەر عوسمانیەکان هەڵهاتن, لە کاتی هەڵهاتنیدا (حسەین بەگ) لە گەڵ (ئیسماعیل بەگ)ی حاکمی (عەقرە) بەرەو (نیروەرو رێکان) ملیان نا, لە رێگە (حسەین بەگ) لە دۆڵێك گلۆر دەبێتەوەو لە ئاوی (زاب)دا دەخنکێ، (ئیسماعیل بەگ) خۆی دەگەیەنێتە (شنۆ) لای کوردەکانی ئێران، پاشان بە یاریدەی (میری هەکاری) کە دەترسا میر محمد پەلاماری ئەمارەتی ئەویش بدات، هەوادارێکی زۆری بۆ کۆکردەوەو هێنایەوە,

---

[٧٨] گۆڤاری کاروان ژمارە(٢٧) ١٩٨٤.

[٧٩] تاريخ الموصل. ص٣١٧.

پـەلاماری (عەمادیـە) یـان دایـەوە, دوو سـەرکردەی مـیر محمـدو زۆر لـە سـەربازەکانیان گـرت، بـەلاّم (موسـا پاشـا) ی بـرای لەوکاتـەدا لـە دەرەوەی قـەلاّبوو, کـە هـەواڵی گیرانـی عەمادیـەی بیسـت, هـەڵهات و بـەرەو (رەوانـدوز) چوو, (مەلا یەحیای مزوری) یش کە هەر لە (عەمادیە) بوو ویستی هەڵبێت، بـەلاّم لـە گـەڵ (مـەلا قـاسمی مـایی) دا گـیران، لـەو کاتـەدا نـاودارێکی سـۆفی گـەورە بـە نـاوی (سـیدائیمجـذوب شـێخ محمـد عـەقراوی) لـەوێ بـوو کـە (ئیسـماعیل پاشـا) زۆر رێـزی لێدەگـرت، لـە بـەرخاتری ئـەو لـە (مـەلا یـەحیا) خۆشبوو[٨٠].

کـە سـوپای عوسمـانی هـاتن بـۆ تـەمێکردنی مـیر محمـدو پـەلاماری عەمادیەیاندا، (ئیسماعیل پاشا) بەرگری بۆ نەکراو هەڵهات بۆ (جزیرە) بۆلای (بـەدرخان بـەگ)، عوسمانیـەکان (یـونس ئاغـا گێلـی) کـە یـەکێك بـوو لـە کەسـایەتیە ناودارەکـانی عەمادیـە, کردیانـە فـەرمان ڕەوای شـار, پاشـان عوسمانیەکان گەرانەوە موسڵ، (یونس ئاغا) (ئیسماعیل پاشا)ی نوێنەری نارد بۆ موسڵ, هەتا لە گەڵ عوسمانیەکان رێك بکەوێت و بیکەنەوە بە میر، بـەلاّم عوسمانیـەکان پـەلاماری عەمادیەیاندایـەوە, شـەڕێکی قـوڕس روویـداو شـارو دێیـەکی زۆر سـووتا، (ئیسـماعیل پاشـا) بـە مـەرج و پـەیمان خۆیـدا بەدەستەوەو ناردیانە بەغدادو لەوێ مرد[٨١]

رەشید پاشا لە زاخۆوە دەستی بە هێرشەکەی کرد, بە ڕێگەی (ئامید) یدا هات, دوای (سێ) مانگ گەمارۆ (ئاکرێ) ی گرت[٨٢]، لێرەدا میر محمد ویستی گەمـەی سیاسـی بکـات, سـوود لـە نێـوان ناخۆشـی ئێـران و عوسمانیـەکان وەربگرێ، دەست و دیاریـەکی زۆری نـاردە لای سـەرهەنگی سوپای ئێران لـە (لاهیجـان), بـۆ ئـەوەی یارمـەتی بـدات دژی عوسمـانی، یـان هـیچ نـەبێ لـەو

---

[٨٠] الاکراد في بهدينان . انور المائی . ص١٥٢. ١٩٩٩دهۆك.

[٨١] هەمان سەرچاوە . ص١٥٤.

[٨٢] کوردەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی . ل١٧٨.

جەنگەدا بێدەنگ بێت، بەڵام ئەو وەرەقەیەش پێشتر فرۆشرابوو بە عوسمانیەکان، چونکە سەرهەنگی ئێرانی دەستو دیاریەکەشی وەرگرتو، وەڵامی نەخێری نوێنەری میر محمدی دایەوە، نەك ئەوەندە، بەڵکو سوپایەکی (دە هەزار) کەسی نارد بۆ سنوورەکانی رەواندوز، ئەمەش بێ سیاسەتی میر محمد نیشان دەدات، یەکەم: حیسابی پێش وەختی بۆ ئێران نەکردبوو، دووەم: بەریتانیاو روسیا هەوڵیاندا ئێران بکەنە لایەنی عوسمانی دژ بە سۆران، تەنانەت وایان داواکرد کە هەر دوو سوپای ئێرانو عوسمانیی لە یەك کاتداو بە نەخشەیەك روو بکەنە ناوچەی رەواندوز، میر محمد بە رۆژهەڵاتو ئێرانەوە خەریك بوو، بەڵام (عەلی رەزا) والی بەغداد بە داوای عوسمانی هێرشی هێناو (ئالتوون کۆپری و کۆیەو هەولێر)ی لە میر محەمەد سەندەوە[٨٣].

(عەلی رەزا) بەبێ یارمەتی عوسمانیەکان و، بە یارمەتی و چاو ساغی (محەمەد بەگی عوسمان بەگی خۆشناو) کە ناحەزی میر محەمەدی ڕەواندوز بوو، پەلاماریداو (شەقڵاوە) شی داگیر کرد ، وابزانم شەقڵاوە بۆ ڕەواندوز زۆر نێزیکەو هەر ڕۆژە ڕێیەك دەبێت..!!

میر محمد زۆر بیری لە ڕێکەوتن دەکردەوە، هەر بۆیە دەمو دەست سوپاکەی کێشایەوە بۆ (دۆڵی گەلی عەلی بەگ) و زۆر قایم دای مەزراند...

رەشید پاشا لە ریای خۆیەوە زۆر خاو دەهات، بۆ ئەوە بوو هەتا سوپاکەی شکست نەهێنێ و لەکەدار نەبێ، لەو نێوانەشدا چەند مانگێك شۆڕشو بەرگری کورد هەر هەبوو، لە گەڵ ئەوەدا زستان هات، کەم خۆراکی هەرای بە سوپای عوسمانی کرد، جگە لەوە کوردەکانیش خواردنیان لێدەشاردنەوە[٨٤].

---

[٨٣] مێژووی میرانی سۆران - ل٦٢موکریانی.

[٨٤] کاروان ژمارە - ٢٧.

## بەریتانیا لە بەرەی دژە کوردا

ڕەواندوز ئامادەباشی تەواوی خۆی بۆ هەموو ڕوداوێك ڕاگەیاند، میر محمد بۆی دەرکەوت ئەو هێزەی کە هاتووە هەتا لە ناوی نەبات ناگەڕێتەوە، هەر بۆیە لە (گەلی عەلی بەگ) دا کە دەروازەی سەرەکی بوو بۆ رەواندوز و گەرویەکی سەخت بوو خۆی دامەزراند، (شاخی سپیلك) ی کردە بنکەیەکی پتەو, قەلاّو سەنگەری بەهێزی بەچوار دەوری رەواندوزدا دامەزراند، هەموو رێگەیەکی تری بۆ رواندوز بەست، بۆ جەنگێکی سەرنویست ساز خۆی ئامادەکرد، سەرەتا بریاریدا پەلاماری ئەو هێزە بدات کە لە (دەشتی حەریر) نزیك بە (خەلیفان و دەربەندی گەلی عەلی بەگ) مۆلّی خواردوە، سەرەتا لە هەموو لایەکەوە بەربوونە هێزە بلاّوەکانی عوسمانیەکان، لە کاروانەکانی پشتەوەیان دەدان، ئازوقەو خواردنەکانیان بە تالاّن دەبردن، عوسمانیەکانیش لە هەموو لایەکەوە گەمارۆی توندی ئابوریان خستبوە سەر شاری رواندوز، قەلاّو دێهاتەکانیان دەڕوخاندن، راستە میر محمد تووشی هێزێکی نابەرامبەر بوو لە رووی ژمارەو چەکەوە، بەلاّم قەلاّو شورەو سوپای گەرم و گوڕو شاخە سەختەکانی، ئەو نابەرامبەریەی راستکردبوویەوە، هەر وەك (فۆن موتکە) سەرکردەی ئەلّمانی کە لەو کاتەدا لە لای عوسمانیەکان بوو, چاودێری جموجوولّی سەربازەکانی دەکرد, دەیگوت: "گرتنی یەك قەلاّی کوردی لە بەرزی شاخێکدا (سی) تا (چل) رۆژی دەویست"[٨٧].

کاوس قەفتان دەلّێ: میر محمەمەد ویستویەتی دەستگایەکی دەرەبەگایەتی سەربەخۆ پێك بهێنێ, بەلاّم ئەم هەولّەیبەسەر خۆیا شکایەوە,چونکە هەر هێرشی عوسمانی نێزیك بویەوە, گەلێك لە دەرەبەگە کوردەکان و سەرەك عەشیرەتەکان هەر کەیەکەم سەرکەوتنی عوسمانیەکانیان و نەهامەتی ولێقەوماوی میر محەمەدیان دی,نەك هەر هەلّوێستی جارانی

---

[٨٧] کاروان ژمارە (٥٢).

خۆیـان گـۆڕی , بـەڵکو دژی وەسـتان و لێی ڕاسـت بونـەوە, کوردەکـانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی,لا١٨٨)

ڕەشـید پاشـا زۆر سـوودی لـە نـاکۆکی نێـوان سـەرەك خێڵـە کوردەکـان دەبینی، هەر کەس خۆی بفرۆشتایە زۆر هەرزان دەیکڕی، بازاڕیش زۆر بوو، دەرەبـەگی ناوچـەکە جـەنگی میریـان قورسـتر کردبـوو، هـەموو ڕێ‌و تولـە ڕێگاکانیان دەزانی کە بەرەو قەڵاو سەنگەرە سەختەکان دەچوون[88] لە گەڵ ئەوانـەدا ڕەشـید پاشـا هـەر خـۆی دەپاراسـت, نەیـدەوێرا بچێتە جـەنگێکی ڕاستەقینەوە, هـەموو هەوڵـەکانی بۆ تێکشـکانی ڕەوانـدوز شکسـتی دەهێنا، لەم کاتانەدا کە عوسمانیەکان لە گەمارۆ توند کردنەوەدا بوون، میر محمد بە هـەموو هێـزو باوەڕیـەوە ئامـادەی جـەنگی خـۆ دەربـازبوون بـوو لـەو تەڵەیـە، (ئێـران) بڕیـاری دا بێتـە نـاو بازنـەی جـەنگ‌و بـەرەی دژی مـیری سـۆران، (بـەریتانیا) دەسـتیکردە پەیوەنـدی کـردن و ڕێکخسـتنی هـەردوو هێـزی (عوسمـانی‌و ئێرانـی)، هـەر چـەند عوسمانیـەکان وایـان نیشـاندەدا بـەو ڕێکخستنە ڕازی نین، بەڵام هەر خۆ ئامادەکردنی ئێران‌و هێنانی چەکدارو تۆپخانـە, لێدانێکی سـەخت‌و کاریگـەر بـوو لـە نـزم کردنـەوەی ورەو, ڕوخـانی دەرونـی سـەرکردەکانی ڕەوانـدوزدا، لـە سـەدا سـەد ڕای گـۆڕین، چـونکە زۆر بڕوایـان بـە سـنورەکانی ئێـران و ڕێی ڕۆژهـەلات هـەبوو بـۆ کـاتی کشـانەوەو هاتنـەوەی سـوپای سـۆران، هـەر ئەمـەبوو تـرس‌و بیمـی بـۆ دروسـتکردن‌و ناچاریکردن مل بە ئاشتی بدەن...!!

لە تەموزی (١٨٣٦ن) بەریتانیا لە (تەورێز) ەوە (شـیل) ی نوێنـەری خـۆی بـەرەو لـە شـکرگەی عوسمـانی نـارد، وەك (کـودینتس) ی کونسـوڵی ڕوس لـە تـەبریز ئاگـاداری (سـیمۆنیچ) ی کـرد، (ئیلـیس) باڵیۆزی بـەریتانیا لـە تـاران داوای لە (شیل) کرد کەوا لە (ڕەشید پاشا) بکات پێکەوە لە گەڵ ئێرانیەکاندا

---

[88] کوردەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی. ل ١٠٧.

دژی میری ڕەواندوز بجەنگن[٨٩] (رووسیا) ش هەمان هەڵوێستی هەبوو، عوسمانیەکان پەیمانیاندا زەرەری (ئێران) ببژێرن کە میری سۆران بە سەری هێنابوون لەپەلامارەکانیدا بۆ ناوچەی (ورمێ)و (دە) گوندی ناوچەی (سوڵدن) لە سەرەتای تشرینی یەکەمی (١٨٣٥ن) [٩٠]، بەریتانیا ئەو هێرشانەی میر محمدی بیری ئێران خستەوە, کە لەو هەلومەرجە نەگونجاوەیدا کردی، ئێران بەو سەفقەیە رازیبوو: (ئەمیر نیزامی) سەرکردەی سوپای ئێران لە (تەورێز) داوای لە (کۆدینتس)ی کۆنسوڵی رووس لە (تەبرێز) کرد, کە تۆپو جبەخانەی بداتێ، ئەوانیش رازی بوون، بڕیاریاندا هەرچیان هەیە لە ناو ئەمبارەکانی ناوچەی خوارووی رووسدا، بیدەن بە ئێرانو دژ بە کوردەکان بەکاری بهێنن, کە بریتی بوو لە (١٥٠٠) گوللە تۆپی عەیاری (٢٤)، وە (٣) هەزار گوللە تۆپ عەیاری (١٤)ە[٩١]، (ئێران) خۆی ئامادەکرد کە (دە) هەزار شەڕکەر، لەمانە پێنج بەتالیۆنی سەربازی پیادەی تیابوو بکەونەڕێ[٩٢].

میر محمد ئەم هەموو نەخشەو هاوکێشە لێکدراوانەی بیست، ئەو هیچ پێشبینیەکی بۆ ڕۆژێکی وا دانەنابوو، ڕەنگە هەتا ئەو کاتە نەیزانیبێ چی چاندوە و چی دەدورێتەوە..؟ نەیزانیبێ چۆن ئەو هەمووە جەنگ وقەتڵ وعامەی کوردانی بۆ چوە سەر، ڕەشید پاشا ناوبانگی (دیبو ماتلی) پەیداکردبوو[٩٣] میر محمد ناچاربوو دەشتی (هەریرو خەلیفان) یش

[٨٩] خەبات لەرێی کوردستاندا. خالفین . ل٦٩ . ئەویش لەئەرشیفی سیاسی دەرەوەی روسیا لاپەڕە ١١٤ وەریگرتوە.

[٩٠] خەبات لەرێی کوردستاندا. ل٦٧، ئەویش لەئەرشیفی ژمارە (١) ی ناوەندی حکومەتی جەنگی سیاسی روسیا لاپەڕە( ٢ ) وەریگرتوە.

[٩١] کوردەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی. ل١٠٩.

[٩٢] خەبات لەرێی کوردستاندا. ل٦٨ ئەویش لەئەرشیفی ناوەندی حکومەتی جورجیا . ل٢٢ وەریگرتوە.

[٩٣] مێژووی میرانی سۆران . موکریانی . ل٨٢.

جیّبهیّلّیّو بە دۆلّی (گەلی عەلی بەگ‌و کیّوی سپیلك) دا بگەڕیّتەوە بۆ دەشتی سۆران‌و ناوچەی ڕەواندوز، جاریّ تر ڕەشید پاشا بە دۆلّی گەلی عەلی بەگدا هیّرشیّکی توندی تری کردەوە، بەلاّم ئەمجارەش بەهیّز تر شکایەوە گەڕایەوە (خەلیفان)، چونکە سەنگەرەکانی میر محمدو سوپای سۆران کە (میر ئەحمەد) ی برای سەرپەرشتی دەکردن زۆر دامەزراو بوو، ئیتر ڕیّگە لە بەردەم ڕەشید پاشادا نەما جگە پەنا بردنە بەر فیّلّ‌و تەلّەکە [٩٤]، وای بینی کە چاکترین هەولّیّك بۆ گرتنی میر محمد، ئەمین کردنەوەیەتی بەفیّلّ، هەر بۆیە دەستیکرد بە ناردنی نامەو نویّنەر. [٩٥] ڕەشید پاشا دەیزانی هەر سەر دەکەون‌و میرنشینی سۆران لەناو دەبەن. بەلاّم بڕوای وابوو زۆر لە سوپای عوسمانیی دەکوژریّ‌و خەلّکی دەشتی سۆران‌و ڕەواندوزیش بە تەواوی لەناو دەچن، سەرکەوتنیّك سەربازیّکی زۆری عوسمانی تیا بکوژیّ، ئەو گرنگیەی نابیّ لای (ئاستانە)، چونکە هەر چەند تۆپخانەو جبەخانە زۆرو کاریگەر بیّت، بەلاّم سەنگەرەکانی میر محمد پتەوترو دامەزراو ترەو ناوچەکەش یەکجار سەختە، بۆ سوپای عوسمانی تەنگەلانە، بەلاّم بۆ میر محمد ڕیّگە گوزەری خۆیەتی‌و، جیّی چاکە بۆ جەنگی پارتیزانی‌و پەلاماری بەپەلەو گەڕانەوە، لەبەر ئەوانە ڕەشید پاشا هەموو هەولّی خستەگەڕ کە ئەوەی ماوە لە جەنگەکەی بەئاشتی‌و ڕیّکەوتن تەواوی بکات، ئەگەر ڕەشید پاشا بڕوای بەهیّزو زرنگی میر محمدو سوپای سۆران نەبوایە، ئەو هەموو پەیمانە چەورەی بە میر محمد نەدەدا.!!

---

[٩٤] کاروان. ژمارە ٥٢. ل١٤١ ـ ١٩٨٧.

[٩٥] تاریخ الموصل. سلیمان الصایغ. ص ٣١٢.

## رووخانی میرنشینی سۆران لەنێوان بڕیاری میر موحەمەدو فتوای مەلای خەتێدا

### رێکەوتنی میر موحەمەدو ڕەشید پاشا

سوپای بەغدادو موسڵ لە دەشتی هەریر خێوەتگای خۆیان هەڵدا، لەشکری رەشید پاشاش بەرۆژئاوای رەواندوزدا هات، لە (هەودیان) کە گوندێکە لە (١٧) کیلۆمەتری رۆژئاوای رەواندوزدا خێوەتگای خۆی هەڵدا، لێرەوە میرنشینی سۆران کەوتە ناو ئابلۆقەیەکی توند، لە رۆژئاواوە لەشکری (رەشید پاشا) بوو، لەهەریرو لای خوارو لەشکری (عەلی رەزا) پاشا والی بەغداد بوو، (لەگەڵ لەشکری بیرقداری والی موسڵ). لە رۆژهەڵاتیشەوە سوپای ئێران سنووری سۆرانی گرێدا، ئیدی هەموو رێگاکانی یارمەتی و دەرچوون و پاشەکشەی لێگیران، لەهیچ لایەکەوە چەك‌و ئازوقەی نەدەگەیشتی.[٩٦]

لێرەدا (میر محەمەد) بۆی روون بوەوە کە ئەگەر شەڕ بکات، سۆران بە میرو گەداوە تیادەچێ، ئەنجا (میر) بیری لەوەکردەوە دەرگەی گفتوگۆ لەگەڵ سوپای عوسمانی بکاتەوەو، وەلامی نامەو نوێنەرەکانی ڕەشید پاشای عوسمانی بداتەوە, لەو دەمەشدا رەشید پاشا نامەیەکی تری بۆ محمد پاشا ناردبوو کە تیایا هاتبوو: "من وائەبینم شەڕنەکەی، ئەگینا تووشی زەرەو زیانێکی زۆر ئەبی، بەڵێنت بدەمێ گەر خۆت بەدەستەوە بدەی وائەکەم بابی عالی (ئەستەمبوڵ) بت بورێ‌و عەفوت بکا، بشتکاتەوە بە میری سۆران‌و، بەخەلات‌و نیشانەی میری سۆرانیشەوە ئەگەرێیتەوە بۆ سۆران ", ئەنجا (میر) بانگی (مەلای خەتێ) ی کرد، ئەو مەسەلەی بۆ گوت‌و، گوتیشی رەشید پاشا دۆستێکی کۆنە بۆ من، باوەڕم هەیە خیانەت ناکا، لەگەڵ ئەو وت‌و وێژ بکەم باشە، (مەلای خەتێ)ش ئەو رەئیەی پەسەندکرد، ئەوجا پاشا داوای لە مەلای

[٩٦] گۆڤاری دەنگی زانا . لاپەرە (٤) ساڵی ١٩٩٤ دکتۆر محمد گەزنەیی.

خەتیّ کرد کە فەتوای راگرتنی شەڕ لەگەڵ سوپای عوسمانی بدات، ئەوە بوو مەلا فەتوای دا، شەڕ لە نێوان میری سۆران و سوپای عوسمانی راگیرا.

ئەمەش دەقی فەتواکەیە: ( بەفەرمانی میر وە بۆ بەرژەوەندی سۆران ئەوا فەتوامان‌دا بەراگرتنی شەڕ لە نێوان سۆران و سوپای عوسمانیدا).

ئەنجا میر محەمەد لە جیی خۆی (ئەحمەد بەگ)ی برای کردە جێنشین, خۆیشی لە گەڵ مەلای خەتیّ چوونە (هەودیان) و لە گەڵ رەشید پاشا کۆبوونەوە، رەشید پاشا زۆر ریزی لێنان, بەڵێنی دایە کە هیچی بەسەر نەیەت، گوتی "وائەکەم (سوڵتان محمود) عەفوت بکات و بشگەرێیتەوە بۆ سۆران وەکو جاران میر بیت"، محمد پاشا چوو بۆ ئەستەمبوڵ، رەشید پاشاش گەراوە بۆ (سێواس)، سوڵتان لەسەر خاتری رەشید پاشا. میری سۆرانی عەفوکردو داینایەوە بەمیری سۆران، سوڵتان میری سۆرانی مۆڵەتداو گەڕایەوە بەرەو وڵاتی سۆران، بەڵام بۆ ناوچاو رەشی گەلی کورد لەوکاتەی کە میر لە ئەستەمبول بوو، رەشید پاشا بە مردنی بەپەڵە مرد، هەندێك دەڵێن بە (تاعون) بوو، والی بەغداد (عەلی رەزا) کە زانی رەشید پاشا مرد، خێرا بروسکەیەکی لێدا بۆ ئەستەمبوڵ, وتبوی ئەگەر محمد پاشا بگەڕێتەوە بۆ سۆران, دیسان کاروباری سۆران شلۆق ئەبیّ و عێراق لە دەستی دەوڵەتی عوسمانی دەردەچیّ، ئەوەشی لەبەر ئەوەبوو، چونکە پێی ناخۆشبوو کە محمد پاشای ڕەواندوز لە بەرەی (هەودیان) و لە سەر دەستی رەشید پاشادا خۆی بە دەستەوەدا (عەلی رەزا) قسەی لای سوڵتان دەرۆیشت، چونکە ئەو بوو (داود پاشا) ی بەغدادی گرت و, دایەدەستی ئەستەمبوڵ, ئەنجا (سوڵتان مەحموود) فەرمانی دەرکرد بۆ هەموو هەرێمەکانی بندەستی عوسمانی، وتبوی لە هەر جێگایەك میری سۆرانی بۆ گەیشتوە بزری بکەن، ئەوکاتە میر لە (سێواس) بوو (والی سێواس) فەرمانی سوڵتانی جێبەجێکرد[٩٧].

---

[٩٧] بنەماڵانی بەناوبانگی رەواندوز. ممدوح مزوری. لاپەرە ٢٧-٢٨، هەولێر ١٩٩٨.

پاشان دەڵێ : "مادام فەتوای مەلای خەتیٚ بەراگرتنی شەڕ بە فەرمانی میر بیٚ، وە بۆ بەرژەوەندی گەلی کوردبیٚ... مەلای خەتیٚ لە خێر بەدەر، چ خەتای نەبووە، چارەك (یەکەم) فەتوایەکە بەفەرمانی میر بووە، گەر بەفەرمانی میر نەبوایە مەلای خەتیٚ کو ئەتوانیٚ ئەو جۆرە فەتوایەی بداو لەبن لووتی میریش دابنیشیٚو هیچ منەتیشی پێنەبیٚ، ئەگەر بەفەرمانی میر نەبوایە دەرحاڵ دەیکوشتو کەسیش نەبوو بلّی بۆ واتکرد".

(دووەمیش) هیچ چارە نەمابوو بێجگە لە راگرتنی شەڕ، گەر شەڕ ڕانەگیرابا، سۆران پەمیرو میرنشینو گەلەوە تیادەچوو، جاکەی فەتوای مەلای خەتیٚ لە سەر مینبەر ئەوەبووە (هەرکەسیٚ شەڕ لەگەڵ خەلیفەی ئیسلام بکا تەلاّقی دەکەویٚ)[٩٨].

دکتۆر گەزنەیی دەڵیٚ: "بەنیسبەت ئەم فەتوایە دووشت لە ئارادان، پێش (حوسەین حوزنی موکریانی) کەس باسی ئەم فەتوایەی نەکردوە، بۆ نموونە گەر لە کتێبەکانی بەر لەئەو رامێنین شتێکی ئەوتۆ نابینین . لەوانەش کتێبی( رۆژی کوردان)ی (عەبدولقادری رۆستەم بەگی بابان) کە بەفارسی نووسراوە، باسی ئەوە دەکات کە باوکی لە نزیکەوە دۆستایەتیەکی باشی لە گەڵ (پاشا کۆرە) دا هەبوەو، هەمووشتێکی بۆ گێڕاوەتەوە. دیسان (کەریمی حیسامی) باسی مەلای خەتیٚ هەرناکات. ئەو دەڵێت یەکێك لە سەرکردەکانی میر محمد کە ناوی (محمد)ەو بەگزادەبوو، لە گەل رەشید پاشا پەیوەندی هەبووە، ئەمە بووەتە هۆی ئەوەی کە پاشا کۆرە ناچاربیٚ رازی بیٚ بەوەی خۆی بەدەستەوە بدات...!!" ئەو بۆچونەش هەر لاوازە, چونکە ژیانی لەوەو پێشی میرمحەمەد دەری خست, کە هیچ کەس نە مەلاو نە گەداو نە سەربازو سەرکردە, نەیان وێراوە قسە لە قسەو بڕیاری میر محەمەددا بکەن. ئیتر کام سەرکردەیە بە ناوی محەمەد کە بەگزادەبوە , میر محەمەدی ناچار کردوە کە لە گەڵ ڕەشید

---

[٩٨] هەمان سەرچاوە . ل٢٩.

پاشادا ڕێك بکەوێت, نە مەلای خەتیّو نە محەمەد ناوێك و نە کەسی تر نەیان توانیوە قسە لە قسەی میردا بکەن, نەخوازەلاّ بڕیاری بە سەردا فەرز بکەن..!!

ئەوەی لێرەدا گرنگە (ئەفسانەی مەلای خەتیّ)یە کە ناوی تەنها لە کاتی سەرهەڵدان و پەیدابونی ناوی (حوسێن حوزنی موکریانی)دا لە ڕەواندوز پەیدابوو، پیش حسەین حوزنی ناوی مەلای خەتیّ نەبووە, مێژوونووسانی تریش باسی ناکەن، یان ئەگەر شتێکی وا هەبوایە کەمەلای خەتیّ گوتبێتی حکومەتی عوسمانی شەرعیەو خەلیفەی ئیسلامەو بەربەرەکانی کردنی دەچێتە خانەی حەرامەوە، ئەگەر مەلایەکی ناوداری وا لە زانستو زانیاری قسەی وای بکردایە ئەم فەتوایە دەنووسراو بۆ ولاّتانی تریان دەناردو دەیانکردە عەجایبێك هەموو جیهانیان لێ ئاگادار دەکرد. بەلاّم کەس باسی ناکات...

دوای ئەوەش پاشا کوّرە شکابوو، سوپای والی بەغداد گەیشتبوە هەریر[٩٩].

مەرحومی (کەریم شارەزا) دەڵێ: ڕووخاندنی میرنشینی سۆران ڕووداوێکی ئەوەندە گەورەی مێژوی کوردە، لە توانای مەلایەکدا نییە بەفەتوایەك بیڕوخێنێ، هەروەك هەندێ مێژوونووسی کوردی وەك حوزنی موکریانی ئاماژەی بۆ کردوە، هۆیەکانی لەناوبردنی ئەو میرنشینە کوردیە, فراوانبوونی دەسەلاّتی سیاسیو سەربازی بووە، بووە مایەی مەترسی عوسمانیو دەوڵەتە ئەوروپیەکان، بوونی جۆرە ڕێکەوتنێك لە نێوان (میر محمدی رواندوزو محمد علی پاشای میسر) بۆ بێهێزکردنی دەوڵەتی عوسمانی.. ئەمانەو لەهەموو لایەکەوە (دراوسێکان) بۆ هێزەکانی پاشای گەورەی هاتنو پاشەکشەیان پێکرد تاکو خۆی لە قەلاّی ڕەواندوز قایم کرد، ئنجا (سەرەك وەزیران رەشید پاشا) نوێنەری نارده لایو ئامۆژگاری محمد

---

[٩٩] گۆڤاری زۆزگ ژمارە(١) کانونی دووەم ١٩٩٩. بلاّوکراوەی بارەگای لق (١٠) پ.د.ك. د. محمد مەلا ئەحمەدی گەزنەیی.

پاشای كرد بۆ خۆ بەدەستەوەدان و، بەلّێنی شەرەفیشی پێدا ئەگەر لەگەڵیدا بچێتە ئەستەمبوڵ و خزمەت سوڵتان، لێبوردنی بۆ دەربچوێنێ...محمد پاشاش دوای دوو ساڵ بەرگری و شەڕ كردن و، لەبەر نەبوونی هاوسەنگی لە چەك و تفاق و هێزی شەڕكەر، بە گوێی (مستەفا رەشید پاشا)ی كردو لە ساڵی (١٨٣٦ن) بەیاوەریی مەلای خەتیّ و دەستەیەك لە دڵسۆزەكانی چوە بارەگای (سەدری ئەعزەم)و خۆی بەدەستەوەدا، دوای لەناو بردنی میرنشینی سۆران، دەوڵەتی عوسمانی لە ساڵانی (١٨٤٢ن) تاكو (١٨٤٧ن) هەردوو میرنشینی (بابان و بۆتان)یشی لەناوبرد"...

كەواتە رووخانی میرنشینی سۆران لە ئەنجامی هۆكاری دەرەوەو ناوەوە بوو، نەك بە فتوای مەلایەكی وەكو مەلای خەتیّ، بەدڵنیاییەوە دەڵێم: مەلای خەتیّ چ دەستێكی نەبووە لەو كارەساتەدا، ئەگەر بڵێین: (نەیویستوە شەر لە نێوان موسوڵماناندا ببێت) ئەدی بۆ هەتا پاشا لە ساڵی( ١٨٢٦ن) ەوە هەتا (١٨٣٤ن) لە داگیركردنی دەڤەرو ناوچە كوردیەكاندا بوو، تەنانەت گەیشتە (ماردین) لە دیوی توركیاش، مەلای خەتیّ ئەو شەڕانەی نێوان (موسوڵمان و موسوڵمان)ی لیّ حەرام نەكرد...) .؟

ئەدی دەبیّ لە رووخانی (بابان و بۆتان و بادینان و شەمزینان) چ مەلایەك فتوای دابێت ...؟[١٠٠] (مەسعود محەمەد) دەڵیّ:

"مەلای خەتی، كە فتواكەی داوە، بۆ بەرژەوەندی خەڵكەكە بووە، چونكە دەبوایە شەڕێكی توند رووبدات، پاشا كوێرە هیچ رێگایەكی دیكەی نەبووە جگە لەوەی شەڕ بكات، شەڕكردنێك سەد دەرسەد بەفەوتانی میرنشینەكەو خەڵكی ناوچەكە تەواو دەبوو، چونكە لە هەلومەرجێكی وادا، هیچ یەك لە دەوڵەتە دراوسێكانیشی بەهانایدا نەهاتن.

بەتایبەتی لەوچاو بەستەكیەی كە جاران دەكراو هەرجارەی دەچوە لای شوێنێك، جا ئێران بیّ یان بەغداو ..هتد، ئەو چاوبەستەكیە لەپاش ئەوەی كە

---

[١٠٠] گۆڤاری رۆژگ ژمارە(١)، كەریم مستەفا شارەزا لاپەرە ٣٢- ٣٣.

(دەوڵەتی بەریتانیا)و (دەوڵەتی رووس) تەرەسوخیان كرد هەدار هەدارانەیان رەفزكردەوە، لەلایەكی دیكەشدا سیاسەتی جیهانی ئەودەم بەنیسبەت پاشا كۆرە دوژمن بوو، ئیدی هیچ شتێك موككین نەبوو، پاشا كۆرە ریٚی ئێرانیشی لیٚ كویٚر بووبووەوە، گەر ویستباش هەڵیٚو بچێتە ئێران، ئێران قبوڵی نەدەكرد، مەوزوعی رووخانی میرنشینەكە جیٚی مشتومڕو موناقەشە نییە، شتەكە زۆر روونـە، ئەوسـاش لای هـەموو لایـەك ئاشـكرابوو، تەنانـەت ئەوانـەی جیاوازیشیان لە بۆچوون و تەریقەتدا هەبوو، ئەوخیانەتەی كە باسی دەكریٚ رەتیان دەكردەوە"[101].

مومتـاز حەیـدەری دەڵـیٚ: "مەسـەلەی مـەلای خـەتیٚ، وا ئاسـان نییـە مـرۆ قسەی لەسەر بكات، خەتێكی راستو چەپ بەسەریدا بێنیٚ، جاریٚ پێشەكی مـن نـازانم رایـەكی تایبـەتی بـووە، دەربڕیـوە، یـان بـەرەسمی فـەتوای داوە، ئەگەر فتوای دابیٚ كەنابیٚ شەڕی دەوڵەتی عوسمانی موسوڵمان بكریٚ، پشت لەپاراستن و پاریٚزگاری میری سۆران بكریٚ، ئەو فەتوایە كوا..؟ هەتا لەبەر رۆشنایی ناوەڕۆكی خودی فەتواكە، مەلای خەتی پەنجەی تاوانی بۆ دریٚژ بكریٚت، وابـزانم ئەوانـەی تائێسـتاكە لـەبارەی فەتواكـەی مـەلای خـەتیٚی رەحمەتیـەوە دەدوێن، نەیان خوێندوەتەوە، كەواتـە ئەو مەسـەلەیە پێویستە لیژنەیـەكی مێژوونووسـان بـە تـەواوی لێـی بكۆڵنـەوە، بـەرەسمی رای خۆیـان بڵێن"[102].

تـاریق جامبـاز دەڵـیٚ: هەنـدیٚ جـار دەبیسـتین كـە ئـەم فتوایـە هەیـە، بـەڵام دەپرسین گەر هەبیٚ بۆ بڵاو ناكرێتەوە ...؟ بۆ ئەم بابەتـە وا باشە تاكو بەڵگە نامـەكانی ئیمپراتۆریـەتی عوسمـانیو وڵاتـانی ئێـرانو بـەریتانیاو ...هتـد بڵاونەكرێنـەوە، نـاتوانین بەیـەكجارەكی سـەد دەرسـەد رای خۆمـان دەربـڕین، بەمەزەندەی خەیاڵیش مێژوو نانووسرێتەوە[103].

---

[101] هەمان سەرچاوە، مامۆستا مەسعود محمد . لاپەڕە ٢٦-٢٧.

[102] هەمان سەرچاوە . مومتاز حەیدەری . ل٣٤.

[103] هەمان سەرچاوە . تاریق جامباز . ل٣٧.

بەڵێ هەموو لەسەر ئەوەن کە (ڕەشید پاشا) نامەیەکی ناسکی بۆ میر محمد نووسیوە، بە چەند وتەیەکی چەورو قەناعەت بەخش ناچاریکرد هێزی ئەژنۆی بشکێ، ئەمە هەندێکی نامەکەیە: ( ...پەیمانتان دەدەمێ ئەمینتان دەکەمەوە، کە هەرشتێك ئێوە پێتان ناخۆش بێت، دەرهەقتان ناکرێت، ئارەزوومان هەر ئەوەندەیە کە ئێوە بکەونە ژێر سێبەری ئیسلامەوە، ئەوسا لە هەموو بەڵاو مسیبەتێك پارێزراو دەبن، لە دنیاو ئاخیرەتدا بە ئاسوودەییو کەیف خۆشی دەژین، شەرتو عەهدی خەلافەتی ئیسلامیتان لەگەڵ گرێ دەدەم، کە ئەمین بنو نەترسێن، بەخەڵات (میری میرانی ئەمارەتی سۆران) تان بۆ تصدیق دەکەم، هەرچیت بوێت دەیدەمو لە هەموو تەنگانەیەکدا یارمەتیتان دەدەم، ئەمانەش کەوتمان لە دوای هاتنتان بۆ بابی عالی جێبەجێ دەکرێت...)[١٠٤] بە ڕاستی نامەکە ناسكو خەڵەتێنەرە، کاریگەرو مژدە بەخشە بۆ کەسێك کە گەمارۆدرابێو هیچ چارەیەکی تری نەبێت جگە لەشەڕ یان تەسلیم بوون، نامەیەکی بەهێزە بۆ کەسێك کە تۆپەکانی عوسمانیو ئێرانیو رووسی بە نەخشەی بەریتانیا لە دەشتی سۆرانەوە بۆی دابەسراوبێت کە چەند کیلۆمەترێکی کەم لە ڕەواندوزەوە دوورە، کە پایتەختی سۆرانەو خەڵکێکی زۆرو سوپایەکی پەنجا هەزاری تیا حەشار دراوە، هەر کەس ڕەواندوزی دیبێ، دەزانێ سەختەو چواردەورەی بەکێوی بڵندو دۆڵێ قوڵ گیراوە، جگە لەچەند دەروازەیەك ڕێگەی هێرشی نەبوو، هەموو سوپای عوسمانی بۆی داگیر نەدەکرا، بەڵام چی دەکەیت لەو تۆپە قورسە رووسیو ئێرانی و عوسمانیە شەلم کوێرم و شێتگێرانەیە، کە تاوانبارو بیتاوان ومنداڵ و چەکدارو مزگەوت و بارەگا ناناسێ، کە دەیتوانی لە دوورەوەو بێ هێرشی پیادە هەموو کۆشكو تەلارو قەڵاو قولەو شووراکان بەسەر سوپاو دانیشتواندا بڕوخێنێو قەتڵو عامی تەڕو وشك بکات، نەك میر محمد، هەر کەسی تر لەو بارە ئاڵۆزەدا بوایە، بە سەرکردەکانی

---

[١٠٤] گۆڤاری کاروان . ژمارە ٥٢. لاپەڕە . ١٤١، بەشی یەکەم عبدالفتاح علی یەحیا.

ئەمڕۆشمانەوە, کە بەزەینی میلیتاریانەی شاخ کاردەکەن، بەو مەرجانە قایل دەبون، ئەویش هەر بۆ بەرژەوەندی کورد، چونکە ئەوانەی کە هاتبوون، بەجەیش و جاشەوە, هەر هەموو هەڵبژاردەی دوژمنانی سەرسەختی کوردبوون, هەتا ئەمڕۆش ئەو هێزانە ڕایان بەرامبەر کورد نەگۆڕاوە، ئەوانە وا هاتبوون نەگەڕێنەوە، ئەوەش کات و ساتی سەرکردەی دڵسۆزە, کە بەچەند مەرجێك خەڵکێك بۆ دوای خۆی بپارێزێ، بەبیانووی ئەو نامەیە عوزر لەسەر خۆی لادەبات و, گەلەکەی لەفەوتان ڕزگار دەکات، من ڕەخنەم لەم هەڵوێستەی میر محەمەد نیە, من گلەییم لە کردەوەو پەلامارە بێبەرنامەکانی پێشویەتی, تۆوێکی وای چاند بۆ ئەمڕۆی, پشت گیرێکی نەبوو لە ناوچەکەدا, ئاوێکی وای ڕشت, هەموو دراوسێکان بە کوردەکانیشەوە حەزیان کرد خۆی تێکەوتوە, دەبوو میر محمد لە سەرەتاوە نەیهێشتایە بگاتە ئەو ڕۆژە، دەبوو لە دۆستی چاك و هەلی لە بارتر گەڕابا, کوردەکانی دڵخۆش و میرنشینەکانی بۆ پاڵپشت بسازاندایە، کارێك دووربینی تیانەبێت, هەر ئەنجامی وادەدات بەدەستەوە، لە هەمان کاتدا لە ساتەوەختی لەو جۆرەشدا, ژیرترین کار بۆ بەرژەوەندی خۆی و کەس وکارو سوپا و گەلەکەی, هەر ئەوەبوو کەخۆی بەدەستەوە بدات.. گەر وای نەکردایە دەکەوتە بەر تان و تەشەری لێکۆڵەرەوانی ئەمڕۆو ڕەخنەگرانی دواڕۆژ, دەیانگوت هەلکی بۆ هاتە پێش و نەیقۆستەوە..

بەم پێودانگە لەشکرەکە هات هەتا گەیشتە (هەریر)، دەوڵەتی ئێرانیش سنووری خۆی داخست, هەموو ڕێگایەك لە میر محمد داخرا, کەوتە ناو ئابلۆقەیەکی گەورە، تەنانەت لە هیچ لایەکەوە چەك و ئازوقەو خواردەمەنی بۆ نەدەهات، میر محمد بۆی روون بوەوە: ئەگەر شەڕ بکات سۆران بەمیرو میللەتەوە تیادەچێ، بۆیە میر محمد بیری لەوە کردەوە کە وتووێژ بکات.

بۆ ئەم مەبەستەش هەوڵێکی جدی دا، کە پەیوەندی لە گەڵ سوپای عوسمانی بکات و شەڕ بوەستێنێت... لەم روانگەیەوە ڕەنگە میر محەمەد کە هەتا ئەم کاتە پشتی بە زەین و بۆچوونی کەس نەبەستوە, ڕای کەسی

وەرنەگرتبوو, لێرەوە لە شکستیەکاندا دەرباریەکانی دەخوێنێتەوە, بۆ ئەوەی هەموویان لە شکستەکەدا بەشدار بن, بەڵام سەرکەوتنەکان هەر تەنهاو بە تەنها هی خۆی بێت, ئەمە بیرۆکەی زۆربەی سەرکردەکانی دنیایە, کە خۆیان بڕیاری تاك ڕەوانەی شەڕەکان دەردەکەن, بەڵام واژۆی ڕێکەوتنە شکست ئامێزەکان بە ناوی گەلەوە دەردەکەن, بۆ ئەو مەبەستە (میر محمد) راوێژی بەژمارەیەکی زۆر لە باوەڕپێکراوەکانی خۆی کرد، یەکێك لەوانە (مەلای خەتیٚ) بووە، (مەلای خەتیٚ) رای میر محمدی پەسەندکرد، میریش داوای لە (مەلای خەتیٚ) کرد کە فەتوایەك بدات بۆ شەڕ راگرتن, چونکە هیچ چارەیەکی دیکە نەبوو جگە لە راگرتنی شەڕ. گەر شەڕ رانەگیرابا، ئەوا سۆران بەمیرو گەلەوە لەناو دەچوو[105]..

وا دیارە میر محمد لەم بارە چارەنووس سازەدا, پرس و ڕای بە هەموو سەرەك خێڵ و سەرکردەو پیاوە ئاینیەکان کردبیٚ، ڕەنگە هەندێکی زۆر لە خەڵك لە گەڵیدابووبن, رەنگە هەبووبیٚ ئەم ڕێکەوتنەی بەفێڵ زانیبیٚ و قسەی خۆی لە پرس و ڕاکەدا کردبێت و لە گەڵیدا نەبووبیٚ و دوای میر محمد درێژەیان بەشەڕ دابێتەوە، رەنگە میر محمد داوای لە مەلای خەتیٚ کردبیٚ قسە بۆ ئەوانەش بکات کە قەناعەت ناکەن ...مەلای خەتێش مادام موفتی میر محمد بووە, کەواتە هەر پیاوێکی ئاینی نەبووە، بەڵکو زانایەکی ناودارو سیاسیەکی بەتوانا بووە، رەنگە (مەلای خەتیٚ) مادام فەتواکە دیارنییە, ڕەنگە لەسەر داوای میر محەمەد ئامۆژگاری کردبن و پیٚی وتبن کە ئێمە گەمارۆ دراوین، تۆپەکان بۆمان دابەستراوە، هەر ئەم شارەشمان بەدەستەوە ماوە، ئەگەر بەشەڕ ناتوانین بیپارێزین با بەئاشتی بیپارێزین, مادام ڕەزامەندی میری لەسەرە، کە بەمەرجیٚ هێزی گەمارۆدەر خۆیان نامەیان ناردوەو, داوای رێکەوتنیان کردوە، پەیمانی شەرەف و دین و ئیمانیانداوە کە میر بپارێزن و میرنشینەکەشی بدەنەوەو بیکەنەوە بۆمان بەمیری میران ..رەنگە بەو وتارانە

---

[105] گۆڤاری رۆژگ ژمارە(١) مەلا عەبدوڵا مەلا سەعید گرتکی . ل٣٥.

هەندێكی تری ڕازی كردبیٚ، دەنا كیٚبڕوا دەكات موفتیەك لەو هەموو شەڕە گەورانەی میر محمد دژ بە عوسمانیەكان‌و یەزیدیەكان‌و خزمەكانی خۆی‌و كوردانی تری میرنشینەكان بەشداری كردبیٚو, فەتوای شەڕنەكردن‌و تەلاّق نەكەوتنی نەدابیٚ، ئێستە كیٚباوەڕی پیٚدەكات شتی وای وتبیٚ..؟ دیارە ئەمە هەر دەستێكە بۆ ناشیرین كردنی ئیسلام‌و ناوی مەلا ...

ئەحمەد باوەڕ دەڵیٚ: (ئەمە ناچێتە عەقڵەوە كە میرنشینێك بە فەتوایەك رووخابێت)[١٠٦] كاوس قەفتان دەڵیٚ: "مێژووی میرنشینەكانی كورد دەری دەخەن، ئەوەندەی سۆران میرنشینی بووە، ئەوەندەش ڕاپەڕین بووە، چونكە جارەهای جار (بابان)ەكان دژ بە دەوڵەتی عوسمانی هەڵساون، بەلاّم رووی نەداوە بە فەتوایەك لەناو بچن، هەر دوای میری سۆران دوو ڕاپەڕینی‌تر لە میرنشینی (بۆتان)و دوای ئەو لە (شەمزینان) روویداوەو دەوڵەتی عوسمانیان هیناوەتە لەرزین, هەردووكیان كوژێنراونەتەوە، بەلاّم بە فەتوا نا...!!)[١٠٧].

پاشان دەڵێت: (ئەو هۆیانەی كە باسمانكرد، دەوریان گەلێك لە ئاین بەهێزتر بوو، بۆ خستنی میری سۆران...)[١٠٨].

ئەمین زەكی كە بەرزترین لێكۆڵەرەوەی مێژووی كوردە هەر ئەوەندە دەڵیٚ: (ڕەشید پاشا كاغەزی بۆ میر محمد پاشا نووسیو گەلیٚ تەئمیناتی بۆ شەرەفی خۆی دایەو لە حاڵی دەخاڵەتیا عەفوكردن‌و ناردنەوەی بۆ جێگەی خۆی پیٚ وەعد كرد...)[١٠٩].

فازیل كەریم، كە ڕانانی كتێبی (ئاغاو شێخ‌و دەوڵەت)ی (مارتین ڤان برونسن)ی كردوەو دكتۆرای لە سەر وەرگرتوەو بەزمانی ئەڵمانی بلاّوبوەتەوە، شانازی بە كتێبەكەوە دەكات، بەلاّم لەچەند جێیەكدا رەخنە لە

---

[١٠٦] گۆڤاری كاروان ژمارە (٨) خولی ڕاپەڕین . ئەحمەد باوەڕ . لاپەرە (٩).

[١٠٧] بابان سۆران بۆتان . ل ٥٧ د.كاوس قەفتان.

[١٠٨] هەمان سەرچاوە.

[١٠٩] كورد كوردستان . امین زەكی بەگ . ل ٢٢٢.

نووسەر دەگرێ، کە بۆچی باش سەرنج و لێکۆڵینەوەی نەبووەو دوای قسەی (فریزەر) کەوتوەو (بەوردی دەورو شوێنی مەلاو زانا ئاینیەکانی لە دام و دەزگاو میرنشینەکاندا هەڵنەسەنگاندوە)و مەلای خەتێ و مەلا ئیدریسی تاوانبار نە دەکردو (ئەو سەنگ و مەحەکەی بۆ مەلا ئیدریسی بەدلیسی بەکارهێناوە، پێچەوانەکەی بۆ مەلای خەتێی داماو بەکارهێناوە، ئەویش وەکو حسین حوزنی موکریانی، رووخانی میرنشینی سۆرانی، (یان راستر بنووسم)، خۆ بە دەستەوەدانی پاشا کۆرەی گێراوەتەوە بۆ فتواکەی مەلای خەتێ، ئەم هەڵەیەش بەرای من لەوەوە هاتووە، کە نووسەر بەوردی دەورو شوێنی مەلاو زانا ئاینیەکانی لەداوو دەزگاو میرنشینەکاندا هەڵنەسەنگاندوە، ئەگینا دوای قسەی (فرایزەر) نەدەکەوت، هەروەك چۆن زۆری رووناکبیرانی ئەمرۆی کورد دەست لە بەرۆکی قسەکانی حسین حوزنی موکریانی بەرنادەن[١١٠].

پێشتر بینیمان کەسێك هەبون لە سەر ئەم باسە قسەیان هەبوو، بە ئینسافەوە رووداوەکانیان بینی و لێکیاندایەوەو راستیان وت، لە هەمان کاتیشدا مێژوونوس و لێکۆڵەرەوەی تریش هەن، پێچەوانەی ئەوانەی پێشوو، نایانەوێت راستیەکان ببینن و، ئەوەی بوە بۆ میللەتەکەیانی روون بکەنەوەو نیشانیان بدەن، دەیانەوێ باسەکان ئاوەژوو بکەن و پشتگوێ بخەن، وردەکاریەکانی روداوەکان و پێشهاتەکان لە بیر بکەن ، تاکە هۆ بۆ رووخانی سۆران و، ئەو چاڵاوەی کە میر محەمەد تێیکەوتبوو لە بیر بەرنەوەو لە خەڵکی کوردی بشارنەوە، هەتا هەق نەبینن و دەستێوەردان و خیانەت و چاوبەست لە کورد و مێژووی کورد بکەن ، تەنهاو بە تەنها هەموو هۆکارەکانی روخانی یەك میرنشینی گەورەی خاوەن پاشای چاونەترس و لەشکرو سوپای پەنجا هەزاری بدەنە پاڵ فەتوایەك، گەربێت و لەوکەسانە وردبینەوە کە تاوانەکە ئاوەژوو دەکەن و بیرو بۆچونیان هەڵسەنگێنین،

---

[١١٠] گۆڤاری رووناکبیری ژمارە (٢) لاپەرە ١٨١، ستوکهوڵم . فازیل کریم ئەحمەد.

ئەوانەی هۆکارە گرنگەکان پشت گوێ دەخەن و, تەنها مەلای خەتێ تاوانبار دەکەن، هەموو ئەوانە لە چەپەکانی کوردن, ئەوانە بە مەرامی دژایەتی ئاینی ئیسلام و ناشیرینکردن و لە بەرچاو خستنی کەسایەتی (مەلا)ی کورد ئەو کارە دەکەن، هەتا کورد گوێ بۆ زانایانی ئیسلام نەگرن و, ملکەچی ئاینەکەیان نەبن, لەجێی ئەوان گوێ بۆ بیرە چەپ و ڕاست و دژ بە ئیسلام و کەسایەتیەکانیان بگرن ... بەلاّم خەلّك ئازادە چی هەلّدەبژێرێ لە ئاین و ئاینزاو بیرو بۆچون ڕێبازو ڕێگەو, هەرچی کە زەینی دەیبڕێ و دەیپێکێ و مەیلی لێیەتی, بەلاّم ئازادانەو ئازایانەو دوور لە تەم ومژو شەڕە قسەو قسەلۆك و یەك تاوانبار کردن و شەڕە پەڕۆ. وتەو بڕگەو بابەتی ناشرینکەر بۆ یەك هەلّنەبەستن, کە نە ئەسلّی هەبێ نە ئەساس, ئەوە برایەتی و هاونیشتیمانی و یەك ڕەچەلّەکی و بۆ یەك ژیان دەشێوێنیّو, وادەکات ئێمە هەر بەخۆمانەوە خەریك بین, داهێنان لە بیرو بۆ چوون و ژیان و زانستماندا نەکەین, گەلێکی خۆخۆرو لە یەك خوێن وەك کەوەکانمان نیشان دەدەین. کە هەر ئەو دەردە بوە هۆی هەموو شکستیەکانی مێژوومان و لە ناوچونی میر نشینەکانمان..

ئەوانە بەم کارەیان راستی دەشێوێنن و ئەوەندەی تر مێژووی کورد ئالّۆز دەکەن، وا لەخوێنەری کورد دەکەن کە چەواشە بێت و, سوود لە هەلّەکان و ئەزموونە تالّەکانی پێشینەمان وەرنەگرن ..کە ئەمە کارێکی زۆر خەتەرناکە دەرهەق بەکورد و خیانەتێکی گەورەی زانستیانەیە, بەرامبەر نەوەکانی داهاتووی کوردستان, ئەوانە ناهێلّن راستی رووگەی پێشینەیان بە باش و خراپیەوە ببینین...

## مەلای خەتیٚ و .. گەشتی ژیانی

(مەلای خەتیٚ) لە حەفتاكانی سەدەی هەژدەیەم لە گوندی (خەتیٚ)ی ناوچەی (خۆشناوەتی) لە دایكبووە، بە (محمد ئەفەندی) یان (محمد خطی ئەفەندی) ناسراوە، لە قۆناغی لاویتیەوە لای زانایانی ناوچەی ڕەواندوز خوێندویەتی[١١١]، وەكو (ئیبن ئادەم و مەلا ئەبوبەكری میر ڕۆستەم و عەبدولڕەحمان ڕۆژ بەیانی) لە خزمەت (ڕۆژ بەیانی) خوێندنی تەواوكردوەو ئیجازەی عیلمی لیٚ وەرگرتوە[١١٢]، لە سەرەتای ڕۆژگاری حوكمی (داود پاشا ١٨١٧ ـ ١٨٣٠ز) بۆ خوێندن دەچێتە بەغداد و دەبێت بە یەكێك لەو زانا بەرزانەی كوردستان كە دۆستایەتی لە گەلٚ (داود پاشا) خۆش بووە ..

داودپاشا بە دۆستی زاناو شێخی تەریقەتەكان ناسراوبوو، سەرەڕای گرنگیدانی داودپاشا بە مزگەوت و قوتابخانەی ئاینی[١١٣].

سەرچاوەیەكی تر بەم جۆرە باس دەكات ( مەلای خەتیٚ لە سنووری نێوان (١٧٧٢ ـ ١٧٧٥ز) داو لە دیٚی (خەتیٚ) لە ناوچەی (خۆشناوەتی) نزیك (بالیسان و خەلیفان) لە دایكبووە، ناودارە بە (محمد ئەفەندی شێخ سلێمانی) لە خێزانێكی ئاینی ناودارە، باوكی زانایەكی ناسراوبوە، هەر لە منداڵیەوە دەستیكردە خوێندن، لای زانایانی ناوچەكە، زۆر جۆر زانستی لا كۆبوەتەوە، بە تایبەتی لە زانستە عەقڵیەكاندا (فەلسەفیەكان) ڕۆچووە[١١٤].

لە سەرەتای سەدەی نۆزدەوە چوەتە بەغدادو لەویٚ خوێندنی تەواوكردوە، زانایانی دیوەو هەر لەوێش بۆ ماوەیەك بوەتە مامۆستا[١١٥]، داود پاشای دوا والی سەربەخۆخوازی مەمالیكی دیوە، داود پاشا ڕێزی زۆری

---

[١١١] میرنشینی سۆران . كامەران جەمال زادە . ل٧٥. هەولێر ١٤١٩.

[١١٢] بنەماڵانی بەناوبانگی ڕواندوز . ممدوح مزوری . ل١٦.

[١١٣] میرنشینی سۆران . ل٧٥.

[١١٤] كاروان . ژمارە (٥٣) بەشی دووەم . ل١٥٠.

[١١٥] گۆڤاری زوزك ژمارە(١) لاپەرە (٢٩) د.محمد گەزنەیی

لیٚ دەگریٚت, پیٚشتر لە گەڵ داود پاشادا لە گەیلانیە پیٚکەوە خویٚندکاردەبن و دەبنە هاوڕیٚ, وا دیارە لە بەغداد کاریگەری بۆچونە سەلەفیەکان کار لە مەلای خەتیٚ دەکات, ئەو بیرۆکەیە لە هەندیٚ لایەنی ژیانیدا دیارە, کە کاریگەر بوە بەو قوتابخانەیە، لە دوایدا حەزیکرد بچیٚتەوە بۆ ڕەواندوز، هەتا ئەو بیرۆکە نویٚیە ئیسلامیە بهیٚنیٚتەوە بۆ کوردوستان ولە ناو زانایاندا برەوی پیٚبدات, ئەمە لە لایەك, لەلایەکی ترەوە دەیویست بیرۆکەی جیا خوازی لە دەوڵەتی عوسمانی بە یارمەتی داود پاشاو پاشای میسر بۆ کوردوستانیش بهیٚنیٚ, دەیویست دڵی میر محمد پاشای سۆران بۆ لای داود پاشا رابکیٚشیٚ, چونکە داود پاشا کەسیٚکی سەربەخۆ خواز بوەو, حەزی کردوە لەو کەسانەش نیٚزیك بیٚتەوە کە ئارەزوی سەربەخۆییان هەیە لە دەوڵەتی عوسمانی. هەر بۆیە لە میر محەمەدی ڕەواندوزو پاشای میسر نیٚزیك دەبیٚتەوە, پەیوەندیەکی دبلۆماسی چالاك و نامە گۆڕینەوەیان لە نیٚواندا دەبیٚت, هەر لەو نیگا سەلەفی مەزهەبیەشەوە بوە کە ماوەی نەدا دەوڵەتی ئیٚرانی قاجاڕی شیعە مەزهەب دەست لە کاروباری ناوچەکەی کوردو میرنشینی سۆرانەوە وەر بدات، (مەلا محمدی خەتیٚ) گەڕایەوە ڕەواندوز، پاشای گەورە زۆر ڕیٚزی لیٚناو پایەیەکی وەکو پایەی (شیٚخی ئیسلام)ی لە میرنشینی سۆران پیٚداو کردی بە ڕاویٚژکاری پشت پیٚ سپیٚرراوی خۆی[١١٦]. ماوەیەك لە بەغداد ژیاوەو دۆستی داود پاشابووە، ئەم دۆستایەتیە بوەتە هۆی ئەوەی کە مەلا محمد ببیٚتە ئەڵقەی پەیوەندی لەنیٚوان والی بەغدادو میری سۆران[١١٧] جیٚی خۆیەتی باسی بکەین کە زۆربەی زانا کوردەکان داود پاشایان ناسیوە پیٚش ئەوەی ببیٚتە والی بەغداد، کاتیٚك کە ئەو قوتابی بووە لە (قوتابخانەی حەزرەتی شیٚخ عەبدولقادری گەیلانی) بۆ چەند ساڵیٚك، وە بۆ چوونە سەر دەسەڵات زۆر سوودی لە زانایانی کورد وەرگرتوە, ناسیونی و هاوڕیٚی گیانی بە گیانی

[١١٦] گۆڤاری زۆزگ ژمارە(١)لاپەرە ٣٢، کەریم شارەزا.

[١١٧] مەلا عەبدولاٚ مەلا سەعید گرتگی، زۆزك ژمارە (١) ل٣٥.

(مەولانا خالید) و (مەلا یەحیای مزوری) و (شێخ عەبدولڕەحمانی رۆژ بەیانی)و زۆری تر بووە. بەهۆی (مەلاونا خالید)ەوە پەیوەندی بە میرانی بابانەوە کردوە، بەهۆی (مەلا یەحیای مزوری) یەوە پەیوەندی بە میرانی بادینانەوە کردوە، بە هۆی (مەلای خەتیٚو مەلا رۆژبەیانی) یەوە پەیوەندی بە میرانی سۆرانەوە بووە، لەبەرئەوە (داود پاشا) یەکێك بووە لە پاشاو والیە دڵسۆزەکانی کوردو سوودی زۆری بۆ کوردەکان بووە، زۆر یاریدەی (محمد پاشا کوێرە)ی داوە لە دامەزراندنی میرنشینەکەداو دژی ستەمو زۆرداران بووە، ئەگەر عوسمانیەکان داود پاشایان زووتر لەناو نەبردایە، بڕواناکەم بەو ئاسانیە میرنشینی (سۆرانو بابانو بادینانو بۆتانو شەمزینان) بکەوتنایە، داود پاشا هەمان رای میر محمدو مەلای خەتیٚی بووەو هەموویان دوژمنی سەرسەختی دەوڵەتی عوسمانیو ئێران بوون، زۆر هەوڵیداوە کوردەکان بەهیچ لایەکیاندا لانەکەنەوە، داود پاشا ساڵی (١٨٣٠ز) دەست بەسەر دەکریٚو دەنێررێتەوە ئەستەمبوڵ، میر محمدیش دوای داود پاشا بە (شەش) ساڵ، واتە ساڵی (١٨٣٦ز) دەگیریٚو دەنێرێتە ئەستەمبوڵ و هەر ئەو ساڵە لە گەڕانەوەیدا لەڕێگە ون دەبێت، وە ساڵی (١٨٣٧ز) مەلای خەتێش دەمریٚ، هەندێك دەڵێن دواتر مردوەو لەگۆڕستانی (گەردە گەرد) نێژراوە، مەلای خەتیٚ جگە لەوەی چەندین زانا لەسەر دەستیدا دەرچوون، کتێبێکی زۆریشی نووسیوە بە تایبەت لەبواری عەقڵیو ئیلاهیدا.

ئەمە بوو ژیانی مەلای خەتیٚ، با ئەوەش دەر بخەین، کە لە چ درزێکەوە ئەم کەسایەتیە تاوانبار دەکرێت، کیٚیەو بۆ چ مەبەستێکی لاواز تاوانباری دەکات..؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟

## حوزنی موکریانی و دروستکردنی ئەفسانەکانی مێژوو

ئەگەر بەناو سەرچاوەکاندا بچینەوەو بەزەینی رۆشن مامەڵەیان لە گەڵدا بکەین، زۆر بە سانایی ئەو پەڵە دەستکردە دەبینین بە پێنووسی نوسەرێکەوە، کە پێشتر زۆر کەس و هەریەکە لە سوچێکەوە تەم ومژوو گومانیان لە کارو کردەوەو نوسینەکانی هەبووە، دۆزینەوەی ئەم داوەی کە حوزنی بۆ مەلای خەتێ ی تەنیوە، لەبەر کارێك بوە کە قەڵەم تەریق دەبێتەوە نوکی بۆ دابهێڵێ و لێکیبداتەوە. باسێکی شەرماویە، مرۆڤ دادەمێنێ کە چۆن لە سەر (حوزنی) ناودارو نووسەرو ماندو بنوسی و تاوانباری بکات، سەرچاوەکان هەموو بۆ ئەوە دەچن. کە موکریانی لەبەر دوولوقمەی ژیان و بژێوی ژینی دونیایەکی فانی. لەبەر خاتری کەسێك کەڕێ ی بکاتەوە لە کونێك ئۆقرە بگرێ، ئەو تاوانە دەکات...

سەرچاوەکان خاڵێکی زۆر گرنگ ڕووندەکەنەوە، کە هەتا ئێستە کەس بەهەند وەری نەگرتووە و بۆی نەچووە، کە دڵسۆزی مەلای خەتێ دەردەخات بەرامبەر پاراستنی ئاینەکەی و پاك ڕاگرتنی عەقیدەی میللەتەکەی...

ئەوکاتانەی کە (داود پاشا) حوکمی بەغدای دەکرد، لە دوای ئەویشەوە بیرۆکەی پاکسازی لە ئایندا، کە لەلایەن (جەمالەدینی ئەفغانی و محمد عەبدەو شێخ رەشید رەزاو محمد عبدالوهاب)ەوە لە میسرو حیجازەوە سەری هەڵدا، کاریگەری لە سەر هەموو زانایان و رۆشنبیرانی جیهانی ئیسلامی دروست کردبوو، بەتایبەت لەوکاتەدا زۆربەی گەلانی ئیسلامی کاریگەری سۆفیسیزم و رێبازە لادەرەکانی لەسەر بوو.. ! بیدعەو خەرافیات و شەعوەزەی زۆر بلاوەی کردبوو، ئەو کارە نابەجێیانەو ئەو رێبازە کە لە سەر شێوازی سیخ و بوزی و هیندۆکیەکان داڕێژرابوو. تێکەڵ بە باوەڕی پاکی موسوڵمانان کرابوو، بووبوو بەئاین ...ئەو زانا ئیسلامیانەش بەنیازی نوێگەری و پاکسازی، یان رزگارکردنی عەقیدەو تەوحید لەچڵك و چەپەڵی و خورافات، شانیان لێهەڵماڵی بوو، لەگەرمەی دابوون، ئەو بیرۆکەیە کەبەهۆی

هەندێ زاناوە گەیشتە بەغدادو, بەهۆی زانایانێکی زۆری کوردەوە لە بەغدادیشەوە گوازرایەوە بۆ کوردستان، لەوکاتەدا سەرسەخترین زانای کوردی ناودار (ئیبن ئادەم) بوو لەناوچەی (باڵەکایەتی وسۆران و هەولێر), کە زۆربەگەرمی بەرگری لەو بیرۆکەیە دەکردو حوجرەو قوتابیەکانیشی پێوە خەریك کردبوو، زۆربەی کاتی ئەم دواییەی تەمەنی بەو بانگەوازەوە خەریك دەکرد، یەکێك لە قوتابیە زیرەکەکانی ناوی (مەلای خەتێ) بوو، بەتایبەت کە لەسەردەمی پێش (داودپاشا) دا چوو بووە بەغدادو, ئەوەندەیتر خۆی بە زانست بەهرەمەند کرد و, بەو بیرۆکەیەوە گەڕایەوە بۆ میرنشینی سۆران, یەکێك لە کارەکانی جگە (کاری موفتی) میرنشین، هەوڵدانبوو بۆ گەڕانەوە بۆ قورئان و سونەت و, دوورکەوتنەوە لە بیدعەو خورافات و ئەو شتانەی کەلکابون بەئاینەوەو ئیسلام لێیان بەرییە، بەڵام چونکە (ئیبن ئادەم) هەر چەند زانایەکی زۆر بەرزبوو، بەلام کەسایەتیەکی توورە بوو, بەزۆر ڕای خۆی فەرز دەکرد، لەبەر ئەو توندیەی (ئیبن ئادەم), ئەو بیرۆکە سەلەفیە لە کوردستاندا وەکو پێویست سەوز نەبوو، بەڵکو بگرە زیاتر خەڵکی لە (ڕێبازەکانی قادری و نەقشییەوە) نێزیکتر دەکردەوە ...

(ئیبن ئادەم) زانایەکی مەزن و فەیلەسوفی زەمانی خۆی بوو، هەڵکەوتێکی مەرجەعیی بوو بۆ زانا کوردەکان[١١٨] گیانێکی نەتەوەیی پاکژی هەبوو بەرامبەر بە گەلەکەی، زۆر گرنگیداوە بەو هەوالانەی کە پەیوەندیان هەبوە بەگەلی کوردو میرنشینە کوردەکانەوە ...یەکێك لەکتێبەکانی (مشکاة المنقول) بەکوردی دایناوە، زانایانیتری کورد زمانی ئەو کاتە ڕەخنەیان لێگرتبووە، وتویانە دروست نیە تا عەرەبی هەبێت بە کوردی شت بنوسی, چونکە عەرەبی زمانی قورئانە, ئەویش لە حاشیەکەیدا دەڵێ( سەرم سوڕما لەگوتنی ئەو مەلایانە، ئەوانە وەکو هێلکەی لە تووکڵەی خۆی هاتونەدەر)، واتە هێلکە بەتوکڵی خۆی رازی نییە، ئەوانیش بەقەومی خۆیان رازی نین ...

---

(١١٨) بنەمالانی بەناوبانگی ڕەواندوز. ل٥٢ . ٥٣.

(ئیبن ئادەم) مرۆڤێکی هەق و رەق بووە، لەسەر مرۆڤی هەژارو بێدەسەلاَت بەجواب هاتووە، هەوەسی بە زۆردار نەهاتووە، هەولٚیدابوو بۆ لەناوبردنی هەندیٚ ئاغاو دەرەبەگ و بەناو شێخی زۆردار، هەر بۆیە ئاغاو بەگ و شێخەکان هەوەسیان پێی نەهاتووە، لە بەرئەوە بووە هەمیشە لەکۆچ و بارو لە هیچ جیٚیەك جێگیر نەبووە، هەروەها دژی کۆلکە شێخەکان بووە، تەنانەت کۆلکە شێخی (بەردە کورە)ی کوشتوەو ئاغایەکیشی سوتاندوە، واتە فەقێکانی بە فتوای ئەو کوشتویانە [119] زیاتر لە پەنجا کتێبی زۆر گرنگی جۆراو جۆری بووە، (مەلای خەتیٚ) قوتابی دەست و دیاری ئەو زانایە بووە...

بۆ زیاتر تێگەیشتن لە تاوانبارکردنی ئەو زانا دلٚسۆزە، چاك وایە هەندیٚ زاناو نووسەر بدوێنیین، بە تایبەت مەزنترین ئەدیب و فەیلەسوف و لێکۆلٚەری کورد (مسعود محمد)، هەتا حەقیقەتێکی ونبوومان لەو بارەیەوە بۆ روون بکاتەوەو دەلٚیٚ: (مەلای خەتیٚ یەکێکە لە زانایانی گەورەی کوردو هەر خۆشی مامۆستای زۆر لە زانایانی ئایینی ئەو سەردەم بووە، مەدرەسەکەشی، مەدرەسەی فەتوای میرنشینی سۆران بووە، ئەو زانایە بەپێی ئەحکامی شەرعی کاریکردوە، خۆزگە سەرجەم فەتواکانی ماوەی (١٥- ٢٠) سالٚی تەمەنی میرنشین کۆکرابانەوەو لەدوو تویٚی کتێبێکدا خرابانە روو، (مەلای خەتیٚ) نەك تەنها ئینسانێکی پاکبووە، بەلٚکو تا بلٚێیت ئینسانێکی کورد پەروەرو دلٚسۆزبووە، بڕوا دەکەم ئەوەندەی لە توانایدا هەبووە، پارێزگاری لە دەولٚەتی پاشای گەورەدا کردوەو خزمەتێکی زۆری میللەتەکەی و میرنشینی سۆرانی کردوە.

ئەو ئینسانە بەدرێژایی سالاَنی سەردەمی ئەو میرنشینە، مەرجەعی دینیبووە، دیارە مەسەلەی فەتواکەش ئەوکات هاتە گۆڕیٚ، کە حوسەین حوزنی کتێبەکەی خۆی چاپ کرد. پێش کتێبەکەی حسین حوزنی ناوو باوی فتواکەی مەلای خەتیٚ هەر نەبووە، لەوکاتەدا حوسین حوزنی هەفتەی جارێك

---

[119] هەمان سەرچاوە. ل ٥٨ . ٥٩.

سەرداني (مەلا ئەفەندي) دەکات، هەر بەم بۆنەیەشەوە لەیەکێ لە سەردانەکانی بۆ لای مەلا ئەفەندی، نوسخەیەك لە کتێبە نوێکەی خۆی پێشکەش دەکات، پاش ئەوەی کە مەلا ئەفەندی کتێبەکە دەخوێنێتەوە، بە (سەید حوسەین حوزنی) دەڵێ: "هەی بێقەزابی، تۆ ئەو غەدرەت بۆ لەمەلای خەتێ کردوە، مەعقول نییە"؛ (عەبدوڵلا موخلیس بەگ) کە خەزوری مەلا ئەفەندی بوو، یەکێکیش بوو لە حەفیدانی برایەکی پاشا کوێرە، پێی وابوو فەتواکە بە تەکلیف و لەسەر رەئی هەموو عائیلەی پاشا کوێرەبوو، بە ئەحمەد پاشاو هەموو برایەکانیشیەوە، ئەوان هەموویان رازی بوونە ئەوجا فتواکە دراوە ... بۆیە پێم وایە مەسەلەی خیانەتی ئەو ئینسانە بەر لە کتێبەکەی حوسەین حوزنی لە گۆڕێدا نەبووە، کتێبەکەی لە بەر مجامەلەو خاتری (سەید تەها) نووسراوە، چونکە (سەید تەها) لەوکاتەدا زۆر رقی لە هەردوو عائیلەی (خەیلانیان و مەلای خەتێ) بوتەوە ... ئیتر شتەکە بەرچاوە، شاراوە نییە، لە جغزی ئینسافەوە، مەبەستیشم ئەوە نیە بڵێم (سەید تەها) ئەو کتێبەی پێ نووسیبێ، بەڵکو حوزنی موکریانی بەو نووسینە مجامەلەی کردوە، بەڵام لە دەمێکدا کە (حسین) خوشنی ئەزیەت و ئازارێکی زۆری کێشا تا چاپخانەکەی گەیاندە رواندوز، بەدەیان دەردی سەری و نارەحەتی تووش هات، لەوناوەشدا (سەید تەهای شەمزینی) یارمەتیەکی باشی داو، خانوو و زەوی و شوێنی بۆ دەستەبەر کرد؛ لە دەرکردنی رازی کرمانجیشدا هاریکاری بوو، ئەمجا بۆ مجامەڵە تەرزیەی دڵی (سەید تەها)، (حوسەین حوزنی) ئەو فتوایەی بڵاوکردەوە، (تەریقەتی نەقشبەندی) لەگەڵ مەزهەبی (مەلای خەتێ) زۆر جیاوازبووە، کەچی تەنانەت ئەوانەی جیاوازیشیان لەبۆچوون و تەریقەتدا هەبوو، ئەو خیانەتەی کە باسی دەکرێ رەتیانکردۆتەوە، بۆنموونە (محەمەدي کوڕی مەلا شێخ تەهای بالیسان) کە بۆ خۆیان (نەقشبەندی) بوون، وە تا ئەو تەریقەتە لەگەڵ مەزهەبی (مەلای خەتێ) زۆر جیاواز بووە، کەچی ئەو سوێندی خواردوە گوتی: مەلای خەتێ

پێـی خـوار دانـەنابوو، بـەڵکو کتێبەکـەی حوسـەین حـوزنی ئـەو هەرایـەی نایەوە[١٢٠].

(عبدالفتاح عـەلی یـەحیا) لـە لێکۆڵینـەوە گرنگەکەیدا هەرچەند زۆر دژ بـە زانایانی ئاینی و مەلای خـەتێ قسـە دەکات، بەڵام دەڵێ: "حوسـەین حـوزنی موکریـانی هەرچـی نووسـیوە بـەبێ سەرچـاوە بـووەو هـەر لـەدەمی خـەڵکی وەرگرتوە، بەڵێ چوەتە رەواندزی، بەڵام دوای (٨٧) ساڵ بەسەر لەناو چوونی پاشا کۆرەدا"[١٢١].

دکتـۆر محمـد گەزنـەیی دەڵێ: "ئـەو پەرتوکانـەی لەوکاتانـەدا دەرچـوون، باسـی ئـەم فتوایـە ناکـەن، نکوولێش لـەوەناکرێ کـە حوسـەین حـوزنی لەگـەڵ (سـەی تـەها)دا زۆرکەسـی دیکـەش دەیانویسـت مـەلای خـەتێ ریسـوا بکـەن، هەرچـی دەروێـش و سـۆفی و وشـکە شـێخ هـەبوون دەیانویسـت لەبـەردەم خـەڵکی و مێـژوودا ریسـوابیێت[١٢٢] لـە گۆڤـاری (روونـاکبیری) کـە لـە (سـوید) دەردەچـێ لەبابەتێکیـدا هـاتوە کەگلـەیی لەنووسـەرێکی ئـەڵمانی دەکـات کەشـتێکی بەهەڵـە وەرگرتـوە لـە(فرایـزەر)ەوە، دەڵـێ: (نـازانم بـۆ زۆربـەی رووناکبیرانی ئەمڕۆ دەست لەبەرۆکی قسـەکانی حوسـەین حـوزنی موکریـانی بەرنادەن ...)[١٢٣].

کامەران جەمال زادە دەڵێ: "لە سیەکانی ئـەم سـەدەیەدا (سـەدەی بیسـت) حوسەین حوزنی موکریانی دەچێتە رەواندوز، لەوێ نیشتەجێ دەبێ، پـاش ماوەیەك کە بە خوێندەوارو رۆشنبیری شارەکە دەردەکەوێت، بنەماڵەی مـەلای خەتێ کە یەکێکبوون لەبنەماڵە ناسراوەکانی رواندوز، ئەوکاتە لەسـەر زەوی و بـەراو کـە بـە ئەمانـەت دابوویـان بـە(حوسـەینی حـوزنی موکریـانی) نێوانیـان

---

[١٢٠] مامۆستا مەسعود محمد . گۆڤاری زۆزك . ل٢٦. ٢٧.

[١٢١] گۆڤاری کاروان . ژمارە . ٣٨. عەبدولفەتاح عەلی یەحیا.

[١٢٢] دکتۆر محمد ئەحمەد گەزنەیی . گۆڤاری زۆزگ ژمارە (١) لاپەڕە (٢٩).

[١٢٣] گۆڤاری روناکبیری . ژمارە (٢) لاپەڕە (١٨١). ستوکهوڵم فازیل کەریم ئەحمەد.

تێکدەچێت، هەر لەوکاتەشدا کتێبی (مێژووی میرانی سۆران) دەنووسیٚ و رقو کینەی خۆی پێیان دادەرێژیٚ. کاتێك داوای دەستنووسی (مالیخا) واتە: (الواقع) ی لێدەکەنەوە، دەڵێت نەماوەو سووتاوە"[124] واتە کاتێك موکریانی دەگوازێتەوە بۆ رەواندوزو خەڵکی بە رۆشنبیری دەزانن. هەرچی دەستنووس و بەڵگەنامەیئەو سەردەمە و میرنشینی سۆران هەیە بۆی دەهێنن، بەلاٚم کە دەستێوەردانیان تیا دەکات، لێی دەکەونە گومانو داوای دەکەنەوە، ئەویش بە بیانووی سووتان لەکۆڵ خۆیان دەکاتەوەو دەڵیٚ هەمووی سوتاوە. بە تایبەت (مالیخا) ئەو کتێبەیە کە بە داوای میر محەمەد روداوەکانی میرنشینەکەی تیا نووسرابوو، هەموو رووداوەکانی میرنشینی سۆرانی بە گەورەو بچووکەوە تیانووسراوە. بەلاٚم (حوسەین حوزنی) بە کەیفی خۆی دەستێوەردانی تیادەکات و دەیفەوتێنیٚ، ئەو هۆیەشی لێدەکەوێتەوە کە ئێمە ئەمڕۆ زۆر لایەنی ئەو میرنشینە نێزیکەمان لیٚ ونەو ناتوانین بچینەوە سەر راستە باسەکانی. بەلاٚم چونکە دوای روخانی بابانەکان دەست نوسەکانیان نەکەوتە دەستی حوزنی موکریانییەکی تر. هەر بۆیە هەموو روداوەکانی بابانەکان پارێزراوەو دیارەو. زۆر شت لە بارەیانەوە گەیشتوەتە دەستمان. بەڵیٚ (مەلای خەتیٚ) دژی ئەوانە بوە کە بەسەر دینەوە ژیاون و بۆ بەرژەوەندی خۆیان بەکاریان هێناوە، هەتا جەنابی (موراد) دەگێڕێتەوەو دەڵیٚ: "باپیرم کە لەلای مەلای خەتیٚ خوێندوویەتی، جارێکیان مەلای خەتیٚ گوێبیستی دەبیٚ کە پێشوازی لەشێخێك کردوە، بۆیە لێی توورە دەبیٚ و، تەنانەت گوتبووی هەموو دەرسەکانم بەخۆڕایی چوون، بۆیە قسەت لەگەڵ ناکەم"[125].

هەروەها دەقێکی دەستنووسی دوولاپەڕەیی (مەلا عەبدولکەریم) لە بنەماڵەی (مەلای خەتیٚ) لەپاش مردنی بەجێماوە بەناوی (رد العلامة

---

[124] میرنشینی سۆران ـ کامەران جەمال بابان زادە ـ لاپەرە (٧٦).

[125] دکتۆر محمد گەرنەیی ـ گۆڤاری زۆزگ ژمارە(١) لاپەرە (٢٨).

عبدالكريم الخيلاني على تقول سيد حزني الموكرياني بحق ملا افندي الخطي (مەلای خەتێ ) الذي اتهمه بالخيانة )[١٢٦]، هەروەها (تاریق جامباز) بابەتێکی بەناوی (لە دەستوونووسێکی خەیلانیدا پێش حەفتا ساڵ باسی دادپەروەری و چۆنیەتی لەناو بردنی پاشای گەورەی ڕەواندوزی کردوە) کە لە ساڵی (١٩٢٧ن) مامۆستای پایە بەرز (مەلا ئەسعەد حاجی عومەر خەیلانی ١٨٥٣ ـ ١٩٣٠ن) بۆی تۆمارکردوین )[١٢٧] کە ڕاستی زۆریان تێدایە دەرهەق بەپاکی و دڵسۆزیی مەلای خەتێ و، ئاشکرابوونی دەستی تێکدەران و شێوێنەران لە مێژووی کوردا، ئەمە جگە لە ڕوونکردنەوەکانی مامۆستا مەسعود محەمەد لە جێی تردا[١٢٨].

زۆرکەس گومان لە دڵسۆزیی و ڕاستگۆیی حوزنی موکریانی دەکەن. هەریەکە بەجۆرێك و سەر بەکارێکی خراپی دژ بە کوردو ئیسلام تاوانباری دەکەن، حوزنی هەوڵی داوە هەرچی دەستنووس و ئاسەواری ناوچەکە هەیە لای ئەو بێت، زۆری کۆکردوەتەوە، تەنانەت خۆی دەگۆڕێت و بە بەرگی ئەفغانی وپاکستانیەوە بە دێهاتەکانی کوردوستانی هەر سێ پارچەکەدا گەڕاوە بۆ کۆکردنەوەی کولتووری جێماوی کوردی ، پاشان دەیانهێنێتەوە بۆ ڕەواندوزو کۆیان دەکاتەوە، پاشتر دەیان کەس لە ئینگلیزو ڕۆژهەڵاتناسە ئەورووپیەکان سەردانی دەکەن، خەڵکی ڕەواندوزو هەولێر گومانی لێ دەکەن وتاوانباری دەکەن بە دزی و چەند جار شکاتی لێ دەکەن ، بڕیاری گرتنی دەردەچێت و لە بەندیخانەدا خۆی دەبینێتەوە، تەنانەت گەورەی ئینگلیزەکان لە ناوچەکەدا هەوڵی بەردانی دەدات. (گیوی) برای دەڵێ: (خەڵکی ڕەواندوز دوژمنایەتیان کردوە هەندێ لە ڕۆژهەڵاتناسەکان تکایان لە (مستەر

---

[١٢٦] میرنشینی سۆران. لاپەرە (٧٩).

[١٢٧] گۆڤاری کاروان ژمارە(١٠٩) ١٩٩٧، تاریق جامباز، لاپەرە (٤٧).

[١٢٨] گۆڤاری کاروان ژمارە (٧١، ٧٢) ساڵی ١٩٨٩ . کتێبی حاجی قادری کۆیی، ل٣٨٧ ج١ بغداد ١٩٧٣.گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد.

ئەدمۆنس) مستەشاری وەزیری داخلیە كرد كە حوزنی بپاریزیّ ، تۆمەت باریان دەكرد كە ئینگلیز پەرستن و جاسوسی بۆ ئەمریكا دەكات. لا ١٣٢ رۆژنامەڤانی ژمارە: ٩ ) پاشان دەلّیّ: (كە لە رەواندوز رۆی چاپخانەكەیان تالاّن كردو خانوەكەشیان داگیر كرد. لا ١٣٢) بەلاّم كە موكریانی پیردەبیّ و بیّسوود دەبیّت، ئیتر ئینگلیز وەك پیشەی هەموو جارانی وازی لیّدەهیّنن و پشت گویّی دەخەن، بەلاّم موكریانی بە هۆی كەریم ئەفەندی تەرجومانەوە پەنا بۆ ئینگلیزەكان برد، ئەوان گوتبویان ئیّمە دلّی لەعلی خان بۆ وی ناشكیّنین. لا ١٣٢) لەوە دەچیّ ئینگلیز واز لە حوزنی موكریانی و سەیتەها دەهیّنن كە قائمقامی ئینگلیز بوو لە رەواندوز و گەورەترین پشت و پەنای موكریانی بوو. سەی تەها هەلّدیّت بۆ ئیّران و موكریانیش دەربەدەر دەبیّت. (گیوی ) ئاوا باس دەكات: (هیّندەی پیّنەچوو سەی تەها بە زمان لوسی ئیّران هەلّخەلّەتا چوە ئیّران، ئیتر بە جاریّ دەرگای پەلامار و بوختان و تەشقەلّەمان لە سەر كرایەوە و هەزاران جار حوزنیان كافر دەكرد و رەنگو بۆی جاسوسیەتیشیان تیّدا، بە گویّی دنیایان راگەیاند كە ئەوان جاسوسی ئینگلیزانن لا١٣٥) بۆچی ئەمە بە پیرەمیّردی نەمرو ئەمین زەكی بەگ و زۆری تر نەكراوە كە هەر لەو كاتەدا بوون، بەلّكو رەمزی شەرەف و مەزنی كورد بون و هەتا ئەمرۆش یەك وشەیان بەرامبەر نەوتراوە و چاپخانەكەی ئەو لەوەی پیرەمیرد ناودار تر نیە..!! باسو خواسی زۆر لەو گۆڤارەدا هەیە كە بە تەواوی حوزنی گومانــاوی دەكــات، ئــەوەش پیّویســتی بــە لیّكۆلّینــەوەی ورد و سەرچاوەی تەواو هەیە، سەرەداویّك لە سەر دەستیّوەردانی (مالیخا)و، ون كردنی ئەو هەموو دەست نوس و بەلّگەنامانەی میرنشینی سۆران بە بیانوی ئەوەی كە گوایە لای ئەو بون بەلاّم سوتاون، كە خەلّكی هەمویان بە ئەمانەت تەسلیم بەو كرد، هەروەها گواستنەوەی خۆی و چاپخانەیەكی گەورە، لەو بارو دۆخە قورس و ریّو بانە خراپ و دوورە نالەبارەدا لە سوریەوە بۆ رەواندوزو، وە دەستكەوتنی چاپخانەیەكی گران بەها لەگەلّ هەژاری حوزنی موكریانیدا، گومانی زۆر لە كاری ئەو كەسەدا وەدەردەكەویّت، بۆچی

موکریانی چوە ڕەواندوز کە لەو سەردەمەدا دوور لە ڕوی ڕۆشنبیری و شارستانی بوو، بۆ نەچوە هەولێرو سلیمانی و کەرکوك، کە هەموو هۆیەکی گونجاوی ڕۆشنبیری بۆ ئەو تیا بوو، ئەمە جێی گومانە، من وای بۆ دەچم کە هێزێك لە دەرەوەی کوردوستان و ناوچەکە، کار ئاسانی بۆ کردوە هەتا ئەو دەست نووس و بەڵگەنامانەی کە پەیوەندی بە شێوازی فەرمانڕەوایی ومێژووی میرنشینی سۆرانەوە هەیە کۆبکاتەوەو بۆیان بنێرێ، کە ڕەنگە ئەو هێزە ڕۆژهەڵات ناسە ئەورووپیەکان یاخود مۆزەخانەو دەزگا ئەدەبی وڕۆشنبیری و سەنتەرە لێکۆڵینەوەکانی دەرەوە بوبێت، کە ئەمە هەتا ئەمڕۆ هەر گومانەو لە سەر چەند خاڵێك دروست بوە، بەڵام ڕەنگە لە داهاتویەکی نێزیکدا زۆر شت لەو بارەیەوە ڕون ببێتەوە، بەتایبەت گومان لە سەر کتێبی مالیخا کە (ئەو دەستنووسەیە کە کاتی خۆی هەموو سەر بوردو کارەساتی میرانی سۆران و میر محمدی بەتایبەت لەسەر تۆمارکرابوو، لە ڕۆژگاری میر محمد خۆیو بەفەرمانی ئەو میرزا مەحموود ناوێك، بەناوی (وقایع نگار) نووسیبوویو دوایی ناوی نا(مالیخا)، لە ساڵی (١٩٣٥ن) کاتێك حوزنی موکریانی دەچێتە ڕەواندوز دەیخەنە بەردەستیو سوودی لێ دەبینێو بۆ نووسینی کتێبی (مێژووی میرانی سۆران)، بەڵام لە خەڵکی ڕواندوزو هەموو ئەو بەڵگانەی لە سەر ئەو بابەتەوە دەستم کەوتووە دەڵێن: بەهۆی دروستبوونی کێشە لەنێوان حوزنی موکریانیو خێزانو بنەماڵەکەی مەلا (خەتێ) کە داوای دەست نووسەکانی لێ دەکەنەوە، موکریانی دەڵێ سووتاوەو دەست نووسەکەیان ناداتەوە، بەڵام کاتێك کە(مێژووی میرانی سۆران) بەچاپ دەگەیەنێ، خیانەت لە ڕووی حەقیقەتی هەواڵەکە دەکاتو مەلای خەتێ تاوانبار دەکات، لە ڕاستیدا چاوگێڕانێکی خێرا بەنووسینو ئەدەبیاتی موکریانیداو سەربووردەی ژیانی لە کاریگەری بەرۆژئاواو ڕەقەبەرایەتی ئیسلامو پیاوانی ئەو ئیسلامە شتێکی چاوەڕوان کراوە[١٢٩].

---

[١٢٩] میرنشینی سۆران ـ لاپەرە (٨٢) پەراوێز.

پێم باشە کۆتایی باسەکە بەدوا وتە بهێنم کە لەلایەن شۆڕشگێڕێکی نوێخوازی کوردەوە، کە شێخی تەریقەتە و سەرکردایەتی گروهێکی چەپە ئەویش (شێخ عیزەدینی حوسەینی) یە، کە سەرکردەیەکی خەباتی کوردانی ئێران بوو، لەبارەی (مەلای خەتێ)وە دەڵێ: (مەلای خەتێ وانەبوە کە دەیگوتن، لەبەینی مەلای خەتێ و میری رەواندوزدا تەبایەك هەبووە، وردە وردە سیاسەتی میر روو لە شکست رۆیوە، خەریکبووە لە گەڵ عوسمانیەکان کە لەشکرێکی زۆریان خڕکردبوەوە بەشەڕ بێن، لە بنیشەوە عوسمانیەکان زۆربەی سەرۆك تیرەکانیان فریو دابوو، میریش زۆر خەڵکی بەناهەق کوشتبوو، میر تەماشای کرد گەر شەڕ رووبدات شکست دەخوات، دەوڵەتی عوسمانیش ناردبووی لەگەڵ میر یەك بکەوێ، ئەمن بۆ خۆم لەسەرئەوە ساغ بوومەوە کەمیر بە مەلای خەتێ ی گوتوە ئەو فەتوایە بدەو خوتبە بخوێنەوە، نەوعێك تەبایی هەبووە. بۆئەوەی خەڵکەکە نەڵێن میر تەسلیم بووە، میریش شەڕەکەی نەکرد، ئەوە تەباییەك بووە (رێت کەوتنێك بووە) پاشان میر چوەتە ئەستەمبوڵ، لە ئەستەمبوڵ کەقەرار وابوو خەلاتی بکەن و بینێرنەوە، زۆریان قەدر گرت و پاشان هێنایانەوە، لەرێ لەدیاربەکر لەهەرجێگەیەکبوو، میر بنگوم کراو نەهاتەوە، تەماشایان کرد، پاش بەینێك لە دیاربەکرەوە چەند شتێکی میر دەفرۆشرێت، میر نەهاتەوەو کوشتیان، کەس نەیزانی چۆنیان کوشت، شانەکە لەسەری مەلای خەتێدا شکاو مەسەلەکە تەواوبوو، جا چونکە هەمیشە دەیانەوێ مەلا خەتابار بکەن، گوتیان مەلای خەتێ خیانەتی کردوە، بەعەقیدەی من وانەبووە)[١٢٠].

ئەمانە هەموو قسەی راست و رەوان و دروست و جێی سەلماندنن، لە هەمانکاتدا ئەوەندەی تریش هەن کە دەڵێن مەلای خەتێ تاوانبارو خیانەتکارە، هەموو ئەمانە قسەکانیان تەنها لە(مێژووی میرانی سۆران) ی حوسەین حوزنی موکریانی یەوە هێناوە، کە ئێمە سەلماندمان حوسەین

---

[١٢٠] گۆڤاری هەڵەبجە. ژمارە. ١٨ . ١٩ مۆلندال. سوید. لاپەرە (٢٨).

موکریانی چۆن دەستکاری ئەو نوسینەی کردوەو ئەو فتوایەی داڕشتووەو لەبەرکیّو لەبەر چیو بۆ چ مەبەستێك بووە، ئەوانەی کە لەم قوتابخانەیەن زیاتر لەچەپەکانن و ئەوانەن کەخراپ بۆ مەلاو پیاوانی ئاین و ئیسلام دەپێون، وەك دکتۆر جەلیلی جەلیلو[١٣١] عەبدولفەتاح عەلی یەحیاو[١٣٢] جەمال نەبەز[١٣٣] و هەژار موکریانیو[١٣٤] لونگریكو[١٣٥] عەلی سەیدو[١٣٦] عەبدولڕەحمان قاسملوو[١٣٧] عەلادین سوجادیو[١٣٨] زۆری تر..

لەبەرئەوە مادام هەموو دەچنەوە سەر قسەکەی حوزنی موکریانی پێویست ناکات قسەکانو شیکردنەوەیان بهێنینەوەو بابەتەکە قەرەباڵغ تر بکرێت، چونکە ئەوەی پێویست بووە لەسەر موکریانی هەموو شتێکمان لە بارەوە وتوە بەزیادیشەوە.



---

[١٣١] کوردەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی . دکتۆر جلیلی جەلیل . ل١٨٤، ١٨٥.

[١٣٢] گۆڤاری کاروان ژمارە (٥٢) لاپەڕە (١٣٥)، عەبدولفەتاح عەلی یەحیا.

[١٣٣] الامیر الکردي . جەمال نەبەز . ص٢٨٩، ٢٩٠ ترجمە . فخري سلاحشور. هەولێر ١٩٩٤.

[١٣٤] شەرەفنامە . وەرگێڕانی لەفارسیەوە هەژار موکریانی . پێشەکی لاپەڕە (٢٧ ) و (٥٠٨) نجف ١٩٧٢.

[١٣٥] اربعة قرون من التاریخ العراق الحدیث . ستیفن لونگریک. ص ٢٤٣ بغداد ترجمە جعفر الخیاط

[١٣٦] من عمان الی عمادیة . عەلی سەیدو گورانی . ص١٣٣ القاهرە.

[١٣٧] کردستان والاکراد . عبدالرحمن قاسملو . ل ٤٧، ٤٨. بیروت ١٩٧٠.

[١٣٨] شۆڕشەکانی کورد . عەلادین سوجادی . ل٦٩ بغداد . ١٩٥٩.

## دوا وتە :

لەم لێکۆڵینەوەدا وا دەردەکەوێت، هەتا پێش بەشداری ئێران لە گەمارۆی ڕەواندوزدا، میر محمدو سوپای ڕواندوز هیچ نکوولیەکیان نەبووە لەوەی جەنگێك بەرپا ببێ هەرچی تیا دەبێ باببێ. سووربوون لەسەر مردنو برواشیان بەسەرکەوتن هەبوو، بەلاّم کە ئێران هاتە ناو بازنەی جەنگەوە لە بەرژەوەندی عوسمانیەکان، کە هەرگیز میر ئەوەی چاوەڕوان نە دەکرد، چونکە جەنگی خوێناوی سەدان ساڵەی نێوان عوسمانی (سوننی)و، ئێرانی قاجاری (شیعە) ئەوەی لێ چاوەڕوان نەدەکرا...هەر بۆیە بەیەکجار و دەمو دەست ورە رووخاو دەستیان لە هەموو لا برا، بەتەنها خۆیان لەناو دۆڵو قەلاّو شاخدا بەگەمارۆدراوی بینیەوە، گەمارۆکەش بەدەم وردە شەڕەوە ئەوەندە درێژەی کێشا, خۆراكو تەقەمەنیان کەم بوویەوە، هەر بۆیە لەوکاتە ناسکانەدا, هەموو پەیمانێکی لەو جۆرە کاری خۆی دەکات, سەرکردە ناچار دەکات بەدوای ڕێگە چاری تردا بگەڕێو, راوێژ بەهەموو ئەوانەی چوار دەوری بکات.

کە میر محمد ڕای گۆڕاو قسە لە گەڵ هەموولا کرا، بەتێکرا ئەوەیان بۆ دروست بوو, کە ڕەنگە دەستدرێژکردن بۆ ئاشتی، هێشتنەوەی سوپاو میرو رواندوزی پایتەخت بە خەڵکەکەیەوە لە لەناوچوونی حەتمی بپارێزێ، بەتایبەت کە عوسمانیەکان زۆر بەگەرمەوە داوای ئاشتی دەکەن و, نامەی چەورو پڕ مژدەو پڕ سوێندو وەعدی شەرەفیان بە نوێنەرەکانیاندا ناردوە بۆ میر محەمەد، چونکە ئەگەر رێك نەکەون, ئەوا عوسمانیەکان بەو سەد تۆپەی کە کۆیان کردوەتەوە، ناوچەکە دەبێژنو, بەو دەیان هەزار سەربازە برسیە شڕە خۆرەی عوسمانی وئێرانی وعەرەبی و خۆفرۆشە کوردەکانەوە, شارو دێ دەسووتێننو ئەتکی ناموسیان دەکەنو هەرچیان بەر دەست بکەوێ دەیکوژنو تالاّنی دەکەن, کەسیش وەفریایان ناکەوێ، هەروەك چیان بە شارو دێو خەڵکی (بۆتانو ئامێدیو جزیرەو زاخۆو زێبارو ئاکرێو هەولێر) کرد،

لەبەر ئەوە میرو سەرداران, لەسەر ئەوە پێکهاتن, کە داوا لە زانایان بکەن بۆ ئامادەکردنی فتوایەکی نەرم و گونجاو، کە لەباتی هەر هەموویان میر محمد خۆی تەسلیم بکاتو, شوێنی ئەو وەعدو پەیمانانە بکەویٚ...بە تایبەت عوسمانیەکان دەیانبردە سەر, چونکە میر محمد پەیمانی بە رەشید پاشادابوو، رەشید پاشا بە محمد پاشای رواندوز دەڵێ: "ئە من لەوەی موتەئەسیفم کەتۆ پارەیەکی زۆرت بۆ ئێران ناردیە بەدیاری، محمد پاشا جوابی دەداتەوە : پاشا ئەسەف مەخۆ، ئەگەر لەسایەی تۆ ئەمن بەکەیف هاتمەوە، ئینتقام لە ئێران لەکنە من سەهلە، ئەگەر نەشهاتمەوە !! خەزنەم زۆرە بەشی تۆش مایە...)"[١٣٩].

میر محەمەد پەیمانێکی وای دا بەرەشید پاشا, ئەوەی لێدەخوێنرێتەوە کە وای نیازە ئەگەر لە ئەستەمبولْ گەڕایەوە ببێتە پیاوی عوسمانی, هەم بەخشش بداتە رەشید پاشاو, هەم شەڕی دژی ئێران بۆ عوسمانیەکان بکات، واتە ئەگەر هاتەوە خراپ بە ئێران بکاتو دڵی عوسمانیەکان خۆش بکات، لە رەوشتی پێشووی میر محمددا هەبوو کە ئەگەر بهاتایەوە چی بە عوسمانیەکانو (میرنشینە کوردەکانی بادینانو بۆتانو هەکاری) دەکرد. ئەمجارە بە پێچەوانەوە لەباتی رۆژئاوا هێرش بۆ رۆژهەلاٚت دەبات و, هەمان کار بە ئێران و (میرنشین کوردەکانی ئەردەلاٚنو بابان ) دەکاتو خراپتریش، چونکە ئەگەر ئەوسا پەناو زلهێزێکی نەبوو، ئەمێستا بەپشتی عوسمانیەکان چی بوێت دەیکاتو, هەرخۆی دەیبردە جەنگی مەزهەبیەوە، ئەمە لەلایەك...لە لایەکی تریشەوە رەنگە راست بێت, کە (سوڵتان) لە ئەستەمبولْ, لەسەر قسەی (رەشید پاشا) زۆر رێزی میر محەمەدی گرتبێت,, ئەو پەیمانەی کە بە (رەشید پاشا)ی‌دا، هەتا کەسێکی لەوجۆرە ئازاو بەتواناو ناودار لەو سنوورە دژوارو پڕ لە کێشەیەدا لە دەست نەچیٚو. بۆ بەرژەوەندیەکانی دەوڵەتی عوسمانی لە کاردابیٚ، واتە میر محەمەد هەر لەژێر سەرپەرشتی

[١٣٩] گۆڤاری کاروان ژمارە (١٠٩) سالی ١٩٩٧، لاپەرە (٥٠)، تاریق جامباز.

سوڵتاندا بەجۆرێ تر، بە پێچەوانەی كارەكانی پێشووی، ببێتە پۆلیسی عوسمانی لەناوچەكەداو سنووری عوسمانی بپارێزێت، لە باتی ئەوەی ڕووی هێرشی (میر محمد) بەرەو باكورو ڕۆژئاواو عوسمانیەكان بێت، ئەم جارە ئەگەر هاتەوە، ڕووی چەك وسەربازانی سۆران كاتە ڕۆژهەلاّت و ئێرانی دوژمنی سەرەكی میرنشینە كوردیەكان، كە عوسمانیەكانیش بەخوێنی سەری میرەكانی تینوبوو...میر محمدیش وادیارە گوێی لێنەبوو چەندە لە ئامۆزاو مام و (بەدرخانی و بادینانی و بۆتانی و یەزیدیان) بكوژێ بە عوسمانیەكانەوە، یان (بابانی و ئەردەلانی و شنۆو لاریجانی) بە ئێرانەوە، بڕواداربێ یان بێبڕواو، شیعە بێت یان سونە، كورد بێت یان تورك یان عەرەب ، هەرچیەك بێت لە هەر نەتەوەو ئاین و ئاینزایەك. عوسمانیەكان بیریان كردەوە، ناوچەكە پۆلیسێكی لەو ترازە نوێیە، لەو جێو ڕێو سنورە ستراتیژەدا دەویست، لەو سنورە ئالۆزەی نێوان ئێران و عوسمانی و بەغداد و موسڵ بابان و ئەردەلان و بادینان و بۆتان بە یەزیدیەكانیشەوە، كەمیر محمد لە ناوەڕاستیاندا چەقی بازنەكەیانی پێك هێنابوو، دەیتوانی یاری بەهاوكێشەكان بكاتو، لە بەرژەوەندی (باب ولعالی و ئاستانە) بە كاربهێنێ، بەڵێ (ڕەشید پاشا) سوڵتانی عوسمانی ڕازی كرد بەو سیاسەتە (بعیدوالمدی) دوور ماوەیە، كە زۆر بەسوود دەبوو بۆ دەوڵەتی عوسمانی لەو كاتە لاوازەیدا كە بە پیاوە نەخۆشەكە ناوداربوو هەموو لا سەری تێكردبوو، لەو دەمەدا عوسمانیەكان بەتەنها تەك و جمی خۆڕاپەراندن و خۆتەیاركردن و ڕاستكردنەوەی باری لاری نەبوو، ئەگەر ئەمڕۆ (ئێران و ڕووس و بەریتانیا) دەستیان داوەتە بنباڵی و ئەو ئەركەیان — لەناوبردنی سۆران — بۆ جێبەجێكردوە، ڕۆژگار هەروا نابێ، بەڵكو شەپیوری سەردەم روو لە خراپتر ملی ڕێی گرتوە، لەبەر هەموو ئەوانە من لەو بڕوایەدام، عوسمانیەكان پەیمانیان دەبردە سەرو، ناوچەكە پۆلیسێكی نێودەوڵەتی لەو جۆرەی دەخواست، بەلاّم هەموو ئەو ڕێكەوتن و پەیمانانە چووە سەرو میر محمد لەگەڕانەوەدا لەناوچوو نەما، كە بەڕای من ئەو نەهاتنەوەیەی لەبەرژەوەندی

کەسایەتی خۆی‌و تێکۆشانی دلێرو سەربەرزی سەربازو خەڵکی سۆران‌و کوردبوو، چونکە گەر میر محمد بگەڕایەتەوەو ئەو پەیمانانەی جێبەجێ بکردایە، هەموو بەرزی‌و ناوداری‌و سەرفرازی خۆی و گەلەکەی لەدەستدەداو، دەبویە نموونەیەکی خراپ بۆ مێژووی کوردو، ناوچەکە ئاڵۆزتر دەبوو، هەموو کەسێك مردن‌و لە دایکبوونێکی هەیە، میر محمد چاك ژیاو سەربەرز ژیا، بەو مردنە ئاڵۆزو نەزانراوو ون بوونەی، سەرداری‌و ناوداری خۆی پاراست، چونکە زۆر مردن لە زۆر جۆر ژیان چاکترە.

# ڕای حوزنی موکریانی بەرامبەر ئیسلام ومەلا و پیاوە ئاینیەکان

شتێکی سەیر لە نوسینەکانی حوزنی موکریانی دا تێبینی دەکەم و لێرەدا هەندێکی دەخەمە ڕوو, حسەین حوزنی کاتێك باسی ئیسلام یان زانایانی ئیسلامی دەکات زۆر بە خەتابارو خیانەت کارو دژ بە کورد ناویان دەبات, لە کتێبی (میرنشینی سۆران) دا چەند نمونەیەك دەهێنمەوە,

* لە کۆتاییی پێشەکیەکەدا دەڵێت : ( لە زاناو گەورەکانی کورد دەپاڕێمەوە ئەم نامیلکەیەم بە دڵێکی خاوێنەوە پەسەند بفەرموون. لا٢ میر نشبنی سۆران , حوزنی موکریانی) موکریانی چونکە دڕدۆنگە دەزانێ خەتابارە لە نوسینەکەیدا, هەر لە پێشەکی کتێبەکەیدا لە زانا ئاینیەکان دەپاڕێتەوە بە دڵێکی خاوێن ئەم سوکایەتیە بە مەلا و موفتیەکانی ئیسلام پەسەند بفەرموون, هەر لە سەرەتاوە خۆی دەزانێت چی چاندوە, داوا دەکات گوماناوی سەیری بابەتەکەی نەکەن.!!

* دەڵێت: (داود پاشا مەلا محەمەد ناو عالمێکی گەورەی کورد کە خەڵکی خەتێ بوو, بە مەلای خەتێ ناودەبرێ , ئەمڕۆ نەتەوەی ئەو لە ڕەواندوز هەن و عالمن, بە دیارییەوە ناردە لای میر کە لە گەڵیا ڕێك بکەوێ کە بۆ ڕۆژی تەنگانە خۆی پێ ڕزگار بکات. لا٦٤) ئەو نەیناردە لای میر , دیاری بۆ میر نەهێنا, هەردوکیان دوژمنی عوسمانی بون.

* **دەڵێت**: ( میر محەمەد هێرشی کردە سەر یەزیدیان , هەزارانی لێکوشتن دوو هەزاری لێبەدیل گرتن, ٥٠٠ کیژوو ژنی گرتبوو کردنیە هەدیەو بەخشش گەلێکی بە گەورەو بە سەرانی موسڵ و ئاغاکانی هەولێر وکۆیەو ڕەواندوز بەخشی, کە میر محەمەد گەڕایەوە ڕەواندوز (عەلی بەگی داسنەی) بانگ کرد وتی بۆ دەست لە فیتنە هەڵناگری , عەلی بەگ میری داسنێ وتی (من بۆ تاکە گیانێك ناپاڕێمەوە) میر ڕقی هەستا فەرمانی دا کوشتیان.) پاشان موکری دەڵێ ( وەکو لە پیاوە پیرەکانی ڕەواندوزم بیستوە عەلی بەگ گەلێك ڕوندو لاوچاك و مەردو شۆخ و شایانی کوژتن وخنکاندن نەبوو , بەلأم میری گەورە

بە دەسیسەی مەلا دین دارەکان لە عەلی بەگی خواستبوو موسوڵمان بیٚ, عەلی بەگیش لە قسەی میری لە هەلاّتن کرد.) ئەمەی دواییان قسەی خۆیەتی و ئاوای هەڵبەستوە, ئاوا وەسفی سەرۆکی یەزیدیان دەکات و ئاواش باسی زانا ئیسلامیەکان دەکات, گەر یەزیدیەکە وابوایە, چۆن توشی ئەو شەڕە دەبوو..؟

* دەڵێت (عولەمایان نەیانهێشت میر شەڕ لە گەڵ تورکان بکات, بەلاّم ئەحمەد بەگ سەرهەنگ قبوڵی نەکرد و گوتی دەبیٚ شەڕ بکریٚ لە شکری میر لە نزیك زیٚی بادینان پێشیان بە تورك گرت. لا٨٠ ) موکریانی خۆی باسی چەندین شەڕەکات لە گەڵ تورکان و ئاستانەی هێنایە لەرزە, بەلاّم بۆ ئەوەی قسەیەك بە عولەمایان بڵیٚ هەر بۆ خۆشی ئەوە دروست دەکات.

* (سوڵتان مەحمودی عوسمانی بە ناوی خەلافەتی ئیسلامیەوە مەنشورێکی بۆ علمایان نارد , بۆ مەلا یەحیای مزوری بۆ مەلا محەمەدی خەتیٚ بۆ مەلا عزرائیل جزیری پڕ لە ئایەت وحەدیس ڕەوانەی کرد بە ناوی دین و خەلافەتەوە گویٚی مەلاکانی کوردوستانی پڕ لە با کرا. لا٨٢) کوا ئەو نامەیە.؟ هەموو دەست نوسەکان لای موکریانی بوو, گەر یەك دێڕی دەست کەوتایە وەك بەڵگە نامە بلاّوی دیکردەوە.. ئەی بۆ لە ئەرشیفی عوسمانیدا بلاّو نەبویەوە..؟

* (میر ٣٠٠٠ کەسی ئازای دژی ئیسماعیل پاشا ناردە ئامێدی , بەلاّم بریقەدار پاشای موسڵ زوتر چوە ئامێدی و قەلاّی توند کرد, ئیسماعیل پاشا قاقەزی بۆ ئەهالی ئامێدی و مەلا یەحیا نوسی کە یاریدەی دوژمنی کورد نەدەن و ئیتاعەی گەورەی میللەت, پێچانەوەو خۆ بەقوربانی دوژمن کردن, دوری مروەتە بۆ ئەسبابی خوێنی موسوڵمانان ڕشتن بیٚ ئیمانیە,ل٨٠) یەکەم مەلا یەحیا لە لای میر محەمەد بوو دژی یەزیدی و عوسمانی جەنگاوە, دوەم خۆی باسی ئەوە دەکات کە مەلا یەحیا لەبەرەی میردایە دژی دوژمنەکانی, ئیتر ئەم چیرۆکانە لە کویٚوە دەهێنیٚ و دروستی دەکات, هەر بۆیە زۆربەی گێڕدراوەکانی تریشی دەکەوێتە ژێر تیشکی گومان ودردۆنگی,

* (لە سەر زیٚ شەڕی گەورەیان کرد دژی ڕەشید پاشا , کورد پڵنگانە شەڕیان کرد بە گەرمە هەڵمەتیان دەبردە سەر دوژمنان بەلاّم چونکە پایەی ئیش لە دەست مەلاو فەقیٚکاندا کلۆر کرابوو شەڕ لە گەڵ ڕۆمدا (عوسمانی)

بێ سوود بوو, مادامە میری گەورە بە بێ فەتوای مەلاکان کاری نەدەکرد لا٨٣) ئەی ئەوە نیە دەڵێ لە گەڵ عوسمانی شەڕی گەورەی کردوە, ئیتر فەتوای چیو کاریگەری چی..؟ ئەی ئەم شەڕە کێ فتوای بۆدا هەتا لە گەڵ عوسمانی شەڕ بکات و لە سێ بەرەدا عوسمانی خراپ بشکێنێ..!! خوێنەری بەڕێز با خۆی بە وردی ئەو دوو لاپەڕەیەی لای موکریانی بخوێنێتەوە گومانی زۆری بۆ دروست دەبێ.

* یەك دێڕ خوار ئەوە دەڵێ (ڕەشید پاشا شکاو هەڵهات لا٨٣) ئیتر ئەو قسە خەڵەفاویانەی دێری سەرەوە چی‌یە کە دەڵێ مەلاکان نەیانهێشت سەرکەوێ, دوای ئەوەش دەڵێ: (تالان وئەسبابێکی زۆر دەست کوردەکان کەوت) لا٨٣

* موکریانی دەڵێ: (ڕەشید پاشا کە هەڵهات و گەڕایەوە موسڵ فەرمانێکی ساختەی بۆ مەلا محەمەدی خەتێ پڕ لە ئایەت و حەدیس کە ئالەتی دەستی تورك بوو بۆ ملەتی کورد کوژتن بەکاریان بردو بۆ میری گەورەیان نارد کە بیخەڵەتێنن, مەلای خەتێ چونکو پەروەرشی دەستی داوود پاشای بەغداد بوولا٨٤) زۆر سەیرە, ساڵێك پێش ئەم شەڕە داود پاشا لە ناوبرابوو عوسمانی بەغدادی گرتبوو, واتە سەرەتا محەمەد پاشای ڕەواندوزو مەلا یەحیای مزوری و داود پاشا لە یەك بەرەدا دەجەنگان دژی عوسمانی, داود پاشا ساڵێك پێش ئەم جەنگە لە ناوچوو بوو, داود پاشا بەردەوام دژی عوسمانی بوو, ئیتر ئەم قسە هەڵیتو پەڵیتانە بایی چەندە, دەڵێ پڕ لە ئایەتو حەدیس ئەگەر دیویەتی پڕ بوە, بۆ لەو هەموو نامەو فتوایانە دانەیەك بەبەڵگە ناهێنێ. باسی بەریتانیا ناکات کە بەغدادو ڕەواندوزی بۆ عوسمانی لە ناوبرد,

* حوزنی دەڵێ : (کەسێك بۆی گێڕامەوە وتی: میر ئەحمەدی برای میری گەورە لە گەڵ مەلای خەتێ لە مەجلسدا بووە کێشەیان, ئەحمەد بەگ داوای لە لەشکر کرد وتی کێ شەڕ لە گەڵ عوسمانی دەکات بکەوێتە لای من و کێ شەڕ ناکات بکەوێتە لای مەلای خەتێ, سەرهەنگ و لەشکر هەموو کەوتنە لای ئەحمەد بەگ و چەند فەقێیەك لەلای مەلای خەتێ و میری گەورە مانەوە, لا ٨٤) ئەمە چیرۆك دروست کردنە, ئەم هەڵبەستە ئەفسانە ئامێزە گەر ڕاست بوایە, دەبوە شەڕی ناوخۆو مەلای هەر زوو تیا دەکوژرا, پێش ئەوەی عوسمانی بێتە ڕەواندوز, خۆ مەلا نە جەماعەتی بووەو نە چەکدار, ئیتر

لایەنی لەکویٚ بوە، خۆی و چەند فەقیٚی کتێب بە دەست، کەی پەیوەندیان بە کاری سەربازیەوە بوە..؟

* (مەلای خەتیٚ بڕیاری دا کە میری گەورە بڕواتە لای مستەفا ڕەشید پاشا، میری گەورەو مەلای خەتیٚ بە پەنهانی لە شکرو سەرهەنگەکانەوە مخابەرەیان لە گەڵ کرد میر ئەحمەدی برای دەکاتە وەکیلی حکومەتەکەی و مەلاو چەند سوارێك هەڵدەگریٚ و دەچنە کن مستەفا پاشا. لا٨٦ ) ئەم چیرۆکە هەڵبەسراوە قسە زۆر هەڵدەگریٚ:١ـ گەر مەلای خەتیٚ بڕیار دەدا، بۆچی میر محەمەد مەلای خەتیٚو چەند سوارێك هەڵدەگریٚ، ٢ـ گەر بە پەنهانی لەشکرو سەرهەنگەکانەوە مخابەرە دەکەن، ئەی چۆن ئەحمەد بەگی برای کردە جیٚ نشینی خۆی، ٣ ــ ئەگەر ئەحمەد بەگی کردبێتە وەکیلی خۆی، ئیتر شەرە قسەی نێوان ئەحمەد بەگ ومەلا بۆچی و لە پای چی، ؟ ئەمە هەموی هەڵەی چاپە یان هەموو درۆیەك هەروایە.!!.

* ( میر باری ٢٠٠ ئێستر دراوی دا بە ڕەشید پاشا، لا ٨٧) بڕواناکەم بە هەموو میرنشینەکانی ئەو دەمەوە باری ٥٠ ئێستر دراویان هەبوبیٚ، ئەم فشە خۆشانەی چۆن بۆ هاتوە، چاك وابوە قسەیەك بکات عەقڵ بیگریٚ،

* ( لەو سەرەوە مەلا عەزیزی موفتی ڕەواندوز کە ئامۆزای پاشا بوون لە بازاڕ کەل و پەلی پاشایان بینی دەفرۆشرا، لا٨٧) ئەمە چۆن ڕێکەوت ئەوان لە ئاستانەوە دەگەڕانەوە، لەو شارە ئەو کەلوپەلانەیان بینی دەفرۆشرا ، ئەگەر ئەم موفتی ڕەواندوزە ئەی مەلای خەتیٚ چی بوەوو موفتی کویٚ بوە.؟

* (ڕەسوڵ پاشا لە پاش میر محەمەدی برای حەوت ساڵ پاشایەتی کرد ،لە گەڵ عوسمانیەکان بە شەڕ هات تورکی شکاند، دیسان عوسمانیەکان مەلاکانیان لە ژێرەوە هانداو ئەوانیش دەهۆڵیان بەناوی ئاین وخەلافەتی ئیسلامەوە لێدا، دەستیان بە چاوو ڕاوو فەتوای ناڕەوا کردو ڕەسوڵ پاشاش چاوو ڕاوی مەلاکان کاری لیٚ کردو دەستی لە شەڕ هەڵگرت و ڕوی لە ئێران کرد. لا ١٠١) ئەم میرانە چی بون هەموو جار بە مەلاکان خەڵەتاون ، جاریٚ، دوو جار، ساڵێك ،دە ساڵ، چۆن بە گویٚیان کردون، گەر ئەم قسەیە ڕاست بوایە، دەبوو ئاین لەو کاتانەدا لە کوردوستاندا ناشرین بوایە وابرەوی نەدەبوو، پێش نەدەکەوت وخەڵکی کورد لە دەمی خۆیان ومالٚو منداڵیان نەدەگرتەوەو خەرجی بکەن لە مزگەوت و حوجرەو مەلا کاندا، ئەم هەموو

بێ سوود بوو, مادامە میری گەورە بە بێ فەتوای مەلاكان كاری نەدەكرد لا٨٣) ئەی ئەوە نیە دەڵێ لە گەڵ عوسمانی شەڕی گەورەی كردوە, ئیتر فەتوای چیو كاریگەری چی..؟ ئەی ئەم شەڕە كێ فتوای بۆدا هەتا لە گەڵ عوسمانی شەڕ بكات و لە سێ بەرەدا عوسمانی خراپ بشكێنێ..!! خوێنەری بەڕێز با خۆی بە وردی ئەو دوو لاپەڕەیەی لای موكریانی بخوێنێتەوە گومانی زۆری بۆ دروست دەبێ.

* یەك دێڕ خوار ئەوە دەڵێ (ڕەشید پاشا شكاو هەڵهات لا٨٣) ئیتر ئەو قسە خەڵەفاویانەی دێڕی سەرەوە چیيە كە دەڵێ مەلاكان نەیانهێشت سەركەوێ, دوای ئەوەش دەڵێ: (تالآن وئەسبابێكی زۆر دەست كوردەكان كەوت) لا ٨٣

* موكریانی دەڵێ: (ڕەشید پاشا كە هەڵهات و گەڕایەوە موسڵ فەرمانێكی ساختەی بۆ مەلا محەمەدی خەتێ پڕ لە ئایەت و حەدیس كە ئالەتی دەستی تورك بوو بۆ ملەتی كورد كوژتن بەكاریان بردو بۆ میری گەورەیان نارد كە بیخەڵەتێنن, مەلای خەتێ چونكو پەروەرشی دەستی داوود پاشای بەغداد بوولا٨٤) زۆر سەیرە, ساڵێك پێش ئەم شەڕە داود پاشا لە ناوبرابوو عوسمانی بەغدادی گرتبوو, واتە سەرەتا محەمەد پاشای ڕەواندوزو مەلا یەحیای مزوری و داود پاشا لە یەك بەرەدا دەجەنگان دژی عوسمانی, داود پاشا ساڵێك پێش ئەم جەنگە لە ناوچوو بوو, داود پاشا بەردەوام دژی عوسمانی بوو, ئیتر ئەم قسە هەڵیتو پەڵیتانە بایی چەندە, دەڵێ پڕ لە ئایەتو حەدیس ئەگەر دیویەتی پڕ بوە, بۆ لەو هەموو نامەو فتوایانە دانەیەك بەبەڵگە ناهێنێ. باسی بەریتانیا ناكات كە بەغدادو ڕەواندوزی بۆ عوسمانی لە ناوبرد,

* حوزنی دەڵێ : (كەسێك بۆی گێڕامەوە وتی: میر ئەحمەدی برای میری گەورە لە گەڵ مەلای خەتێ لە مەجلسدا بووە كێشەیان, ئەحمەد بەگ داوای لە لەشكر كرد وتی كێ شەڕ لە گەڵ عوسمانی دەكات بكەوێتە لای من و كێ شەڕ ناكات بكەوێتە لای مەلای خەتێ, سەرهەنگ و لەشكر هەموو كەوتنە لای ئەحمەد بەگ و چەند فەقێیەك لەلای مەلای خەتێ و میری گەورە مانەوە, لا ٨٤) ئەمە چیرۆك دروست كردنە, ئەم هەڵبەستە ئەفسانە ئامێزە گەر ڕاست بوایە, دەبوە شەڕی ناوخۆو مەلای هەر زوو تیا دەكوژرا, پێش ئەوەی عوسمانی بێتە ڕەواندوز, خۆ مەلا نە جەماعەتی بووەو نە چەكدار, ئیتر

لایەنی لەکویّ بوە، خۆی و چەند فەقیّ کتیّب بە دەست، کەی پەیوەندیان بە کاری سەربازیەوە بوە..؟

* (مەلای خەتیّ بڕیاری دا کە میری گەورە بڕواتە لای مستەفا ڕەشید پاشا، میری گەورەو مەلای خەتیّ بە پەنهانی لە شکرو سەرهەنگەکانەوە مخابەرەیان لە گەلّ کرد میر ئەحمەدی برای دەکاتە وەکیلی حکومەتەکەی و مەلاو چەند سوارێك هەڵدەگریّ و دەچنە کن مستەفا پاشا. لا٨٦ ) ئەم چیرۆکە هەڵبەسراوە قسە زۆر هەڵدەگریّ:١ـ گەر مەلای خەتیّ بڕیار دەدا، بۆچی میر محەمەد مەلای خەتیّو چەند سوارێك هەڵدەگریّ، ٢ـ گەر بە پەنهانی لەشکرو سەرهەنگەکانەوە مخابەرە دەکەن، ئەی چۆن ئەحمەد بەگی برای کردە جیّ نشینی خۆی، ٣ ـ ئەگەر ئەحمەد بەگی کردبێتە وەکیلی خۆی، ئیتر شەرە قسەی نێوان ئەحمەد بەگ ومەلا بۆچی و لە پای چی، ؟ ئەمە هەموی هەڵەی چاپە یان هەموو درۆیەك هەروایە.!!.

* ( میر باری ٢٠٠ ئیّستر دراوی دا بە ڕەشید پاشا، لا ٨٧) بڕواناکەم بە هەموو میرنشینەکانی ئەو دەمەوە باری ٥٠ ئیّستر دراویان هەبوبیّ، ئەم فشە خۆشانەی چۆن بۆ هاتوە، چاك وابوە قسەیەك بکات عەقلّ بیگریّ،

* ( لەو سەرەوە مەلا عەزیزی موفتی ڕەواندوز کە ئامۆزای پاشا بوون لە بازاڕ کەل و پەلی پاشایان بینی دەفرۆشرا، لا٨٧) ئەمە چۆن ڕێکەوت ئەوان لە ئاستانەوە دەگەڕانەوە، لەو شارە ئەو کەلوپەلانەیان بینی دەفرۆشرا ، ئەگەر ئەم موفتی ڕەواندوزە ئەی مەلای خەتیّ چی بوەوو موفتی کویّ بوە.؟

* (ڕەسولّ پاشا لە پاش میر محەمەدی برای حەوت سالّ پاشایەتی کرد ،لە گەلّ عوسمانیەکان بە شەڕ هات تورکی شکاند، دیسان عوسمانیەکان مەلاکانیان لە ژێرەوە هانداو ئەوانیش دەهۆڵیان بەناوی ئاین وخەلافەتی ئیسلامەوە لێدا، دەستیان بە چاوو ڕاوو فەتوای ناڕەوا کردو ڕەسولّ پاشاش چاوو ڕاوی مەلاکان کاری لیّ کردو دەستی لە شەڕ هەڵگرت و ڕوی لە ئێران کرد. لا ١٠١) ئەم میرانە چی بون هەموو جار بە مەلاکان خەڵەتاون ، جاریّ، دوو جار، سالێك ،دە سالّ، چۆن بە گویّیان کردون، گەر ئەم قسەیە ڕاست بوایە، دەبوو ئاین لەو کاتانەدا لە کوردوستاندا ناشرین بوایە وابرەوی نەدەبوو، پێش نەدەکەوت وخەڵکی کورد لە دەمی خۆیان ومالّو منداڵیان نەدەگرتەوەو خەرجی بکەن لە مزگەوت و حوجرەو مەلا کاندا، ئەم هەموو

بوختانە چۆن دەچێتە سەر خەڵکی کورد گەر ئەوەندە ساویلکە بونایە کە موکریانی دەڵێت دەستور شەش زوو مەلا و مزگەوت لە بەرچاوی خەڵکی بکەوتنایە

* (میر محەمەد پاشای ڕەواندوز کە بە هاندانی مەلای خەتێ و مەلا یەحیای مزوری و مەلا عەلی جزیرە، پەلاماری بردە سەر دێهاتەکانی شێخان وکوشتاری زۆری یەزیدیانی کرد... لە گەڕانەوەدا لە سەر ئارەزوی مەلا ناوبراوەکان کزشتارێکی بێ جێو ناڕەوای لێ کردن لا ١٠٨ ) دەبوو بیرتایە بە فتوای ئەوانە..........!!

* (دەستوری دەوڵەتی محەمەد پاشا قورئان بوو، وەهی عوسمانیان پێچەوانەی قورئان بوو، کە مەلا سەر بەتورکەکان دەیانگوت تفەنگ بە تورکەوە نان زیانی بۆ ئاین وتەلاق هەیە...گەورەترین تاوانی میر محەمەد ئەوە بووکە مەیدانی دا مەلایان خۆیان تێکەڵ بە کارو باری دەوڵەت بکەن. لا ١٠٩ ) بڕواناکەم هیچکەس لە کورد پێش موکریانی قسەی وای کردبێ ,کەسێك هیر نەکرابی وبە بەرنامە نەهێنرابێ بۆ ڕەواندوزو ئەو هەموو بوختانە بێبەڵگەو بێبەڵگەنامە بهێنێ و فەرمێکی میری یان دەوڵەتی عوسمانی نەهێناوە,

* لە زاری کرمانجیدا بەرامبەر مەلاکان دەڵێ: (ئەم میقرۆبانەش زۆریان لە ژێر سێبەری دیندا خوێنی میللەت ئەمژن. بڕوانە گۆڤاری ڕۆژنامەڤانی ژمارە: ٩ لا ١٣٢ هاوینی ٢٠٠٢) یەك کتێبی وا قسەی خراپی بەرامبەر ئیسلام ومەلاکان هەیە, بەڵام بائیتر بەس بێت..؟؟

# بەریتانیاو پیاوانی بەریتانی لە دیدی موکریانیەوە

- موکریانی بە هیچ شێوەیەك دەست درێژناکات بۆ باسکردنی دەست و نەخشەی بەریتانیا بۆ پاڵپشتی دەوڵەتی عوسمانی, گەر بەریتانیا نەهاتایەتە هاوکێشەکەوە بۆ بەرژەوەندی عوسمانیەکان, هەر زوو عوسمانی کەوتبوو وە دابەش بووبوو, وە کورد ڕزگاری بوو بوو, لە گەڵ عێراق و شام ومیسر و نیوە دورگەدا, تەنانەت باسی دەستی ئێران وڕوس ویەزیدیان ومیرو بەگە کوردە خیانەت کارەکان کە هەموو سەرچاوەکان بە درێژی وپڕ بە دەلیل باسیان کردوە, ئەم باسی ناکات, تەنها باسی خیانەتی مەلا بێدەسەلاتەکان دەکات و بەس..!!
- موکریانی باسی زیاتر لە ٢٠ متەسەریف و قائیمقامی کوردی لە ڕەواندوز کردوە , کە باسی قائیمقامە کوردەکان دەکات بەبودەڵەو خراپ ونەزان جۆرە وشەی نزم ناویان دەبات (تێنەگەشتوو, تورك پەروەر, بە دەعیە, هیچ نەکەر, ئەهالی ڕەواندوز دەریان کرد, نەزان, ڕوتیان کردوەوە), بەڵام کەباسی قائیمقامە بەریتانیەکان دەکات بەم جۆرە:میجەر نۆئێل حاکمی ئینگلیز لە قەزای ڕەوندوز باسی چاکەو پیاوەتی دەکات, (لا ١١٤ ) دوای ئەو باسی سێ کەس (a*p*o) ی ئنگلیزی دەکات , دوای ئەوان باسی کابتن کرك دەکات ( لا١١٥) ئەم ئینگلیزانە لەسەر ئاژاوە ڕەواندوز جێدەهێڵن, گەورەکانی ئەو شارە چون و لەبەر کابتن پارانەوە و تکایان لێ کرد کە جێیان نەهێڵێ.(لا١١٥) بەڵام میجەر کرك ڕەواندوزی بەرداو چوە باتاس , دیسان گەورە پیاوانی شار چونە لای خواهیشتیان لێ کرد بگەڕێتەوە ڕەواندوز (لا١١٦) ئەویش حاجی نەوزەر ئەفەندی کردە وەکیلی خۆی.(لا ١١٦) هەر لە وێدا کەباسی شێخ مەحمودی نەمر دەکات, چونکە سەر بە ڕێبازی ئاینی ئیسلام بوە ئاوا باسی دەکات: (هەرای شێخ مەحمود کوردوستانی شڵەژاند), بەڵام ئاوا باسی کابتن میجەر دەکات : چوە ڕەواندوز گەورەکانی کۆکردەو باسی سوڵح وسەفای بۆکردن, پاشان دەڵێ: یوسف بەگی بە مشکیەکەی لە

دیوەكەی خۆی خنكاند, بەلاّم بە شتیٚكی تر بۆی دەپۆشیٚ,(لا١١٧) باسی بارزانی و زیباریەكان بەم جۆرە دەكات: (بەسەر عەقرەدا دەدەن و تالاٚنی دەكەن, سورچی وبادینان وسۆران ڕیٚكەوتن چونە سەر ڕەواندوز ئەوەی لە دەستی ئەرمەن و ڕوس و ئاشوری ڕزگاری بوو ئەمان بردیان,لا ١١٩)

- **سەی تەهای نەفەندی** : ئەمە كەسایەتیەكی سەر بە ئینگلیز بوو,بەهاری ساڵی ١٩٢٣ لە لایەن حكومەتی بریتانیاوە كرا بە قائمقامی ڕەواندوز,چاپخانەو گۆڤارو مەكینەی هەنگوین وجوجەڵەو كەرەسەی ئاوریشمی هیٚناو قوتابخانەی بۆ منداڵاٚن دامەزراند لە ڕەواندوز بەرەو ئاوەدانی چوو ئاسایشی دامەزراند ساڵی ١٩٢٨ سەی تەها چوە ئیٚران و لە تاران ئیستیعفای كرد لا١٢٠ میٚژووی میرانی سۆران..حسەین حوزنی موكریانی هەولیٚر ١٩٦٢ چاپخانەی كوردوستان ساڵی ١٩١٥ لە حەڵەب دامەزرا, سەی تەها زۆر یارمەتیدا.

## حوزنی موكریانیوشیعره هەڵبەستراوەكەی هورمزگان

یەكێكی تر لەو كاره خراپانەی كە حسەین حوزنی موكریانی دەرهەق ئەدەبی كوردی و ئیسلام كردویەتی، ئەو شیعره دروست كراوەیە كە لەگەڵ (دكتۆر سەعیدخانی كوردستانی)، بۆ ناشرین كردنی ئیسلام هەڵیانبەستوەو، داویانە بە (محەمەد تەقی مەلیك الشوعەرا_ بهار) كە نوسەرێكی بەناوبانگی ئێرانی بوەو، سەرقاڵی لێكۆڵینەوەو بەدواداچونی شیعری كۆنی ئێرانی بوە و، داوای سەرچاوەی لە دكتور سەعیدی كوردوستانی كردوە، ئەویش شیعری هومرزگانی هەڵبەستوەو داویەتیەو وتویەتی ئەمە كۆنترین شیعری كوردیە، گوایە لە سەر چەرمێك نوسراوەو لە ئەشكەوتی (هەزار مێرد) دۆزراوەتەوە، (ڕەشید یاسەمی، كوردو پیوستەگی نژادی و تاریخی لا١١٩ ایران) یان وتویەتی لە (كۆسالان) لە هەورامانی تەخت دۆزراوەتەوە، (كورد ،تورك، عەرەب، س.ج. ئەدمونز. لا٣٩٢) مەلیك شوعەراش لە كتێبەكەیدا بەناوی ( شیعر در ایران) لە ئێران بلاوی كردوەتەوەو، (حوزنی موكریانی)ش لە عێراق لە ساڵی ١٩٣٠ دا بلاوی كردوەتەوە، ( زاری كرمانجی ، حوزنی موكریانی ، ژماره ٢١ ساڵی چوارەم ١٩٣٠ لاپەرە ١٩ لە ژێر ناونیشانی ( سەرمایەیەكی گران بەهای مێژووی كوردان!) بلاوی كردەوە بەم جۆره :

هورمزگان رەمان اتیران كوژان　　هۆشیان شارەوه گەڤرەگەڤرەكان
زۆر كره عارەب كوردی نەخابور　　گەنانە پاڵە بەشی شارەزور
ژن و كەنیكان وە دیل بەشینان　　مەرد ازا تیلین ژروی هەوینان
رەوشی زەردەشت مایەره بێدەس　　بیزكانا كت هورمز وە هیچ كەس

واتە: پەرستگاكانی زەردەشتیەكان وێران كران و ئاتەشگەی ئاگرەكان كوژێنرانەوه، گەورەكانی كورد خۆیان شاردەوه، زۆرداری عەرەب دیهاتكانیان هەتا شارەزور وێران كرد، ژن وكچەكانیان بە دیل گرت، پیاوی ئازا لە خوێنی خۆیدا دەگەوزا، ڕەوشتی زەردەشت بەبێ كەس مایەوه، ئاهورامەزدای پیرۆزیش بەزەیی بە كەسدا نەهاتەوه.

( بڕوانە ڕۆژنامەی یەکگرتوو ژمارە ( ٥٨٤ بەروار ١١|٤|٢٠٠٦) عەبدولا نەجمەدین تەها, بابەتی ئەنفالکردنی گەلی کورد) تەنانەت موکریانی دەستکاریەکی زۆری شیعرەکەی کردوە, بۆ ئەوەی لە نوسینی زۆر کۆن بچێت , بەلام سیحرەکە بەسەر ساحیرەکاندا شکایەوە, ئەمیش چوە پال ئەو هەموو ئەفسانە هەلبەسراوانەی تر کە لە مێژووی کوردا کردویانە.

عەلادین سوجادی لە ( مێژووی ئەدەبی کوردی, لاپەڕە ١٢٩ـــ ١٣٠ چاپخانەی مەعاریف, ) دوای ئەوەی شیعرەکە بە دەسکاری زۆرترەوە دەهێنێ و دەلێ: (من ناتوانم بچمە ژێری و بلێم بونی ئەم شیعرە ڕاستە یان ڕاست نیە, چونکە نەخۆم ئەو پارچە چەرمەم دیوە کە ئەم شیعرەی لە سەر نوسراوە, وە نە لە قسەی ڕۆژهەلات ناسێکەوە بەرچاوم کەوتوە.)

ئەنوەر سولتانی لە کتێبی (کەشکۆلە شعرێکی کوردی گۆرانی, لا٣٩) دەنوسێت: (من نەمتوانی سەری ئەو هەودایە بدۆزمەوەو بزانم شعرەکە کەی ..؟ چۆن..؟ لە کوێ..؟ دۆزراوەتەوە و ئێستا لە کوێ یە ,مەخابن هەندێ سەرچاوەی کوردی ئەو شیعرە نەزانراوە نەناسراوەیان وەك یەکەمین شعری کوردی دوای ئیسلام لە قەلەم داوە)

ئەحمەدی شەریفی لە (ڕۆژنامەی ڕزگاری ژمارە ٢ سالی ١٩٩٣) دا دەلێ: پێم وایە دکتۆر سەعیدخان خۆی ئەم شیعرەی هورمزگانی داناوەو داویە بە مەلیك الشوعەرا, ئەویش بلاوی کردوەتەوە.

دکتور کەمال فوئاد لە (گۆڤاری (گۆڕین) ژمارە ١١٢ ی سالی ١٩٧٥ لە قەولی خوالێخۆشبوو (پرۆفیسۆر تەوفیق وەهبی بەگەوە) دەنوسێ: ئەم شیعرە لە لایەن دکتور سەعید خانی کوردوستانی وداماو حوزنی موکریانییەوە سازکراوەو بلاوکراوەتەوە.

دکتور جەمال نەبەز لە کتێبی (زمانی یەکگرتووی کوردی, لا ١١١ )دا دەلێ: (ئەمە پەنجا سال زیاترە کە لە گەل سەرچاوەی کوردی و بێگانەدا هەوالێك بلاو دەکرێتەوە کە گوایە دەروێشێك لە دەشتی شارەزور پارچە پێستێکی دۆزیوەتەوە کە بە ڕێنوسی پەهلەوی چوار دێڕ هۆنراوەی کوردی لە سەر

نوسراوە کە هۆنەرەکە گوایە ئاخ و داخی هەڵکێشاوە بۆ ئاینی زەردەشتی کە چۆن لە لایەن هێرشبەرانی عەرەبی موسوڵمانەوە لەنێوبراوەو, سکالاّ لە دەست ئەو هێرشبەرانە دەکات کە چۆن ژن و کچی کوردیان بە دیل گرتوەوخوێنی خەڵکیان ڕشتوە) دکتور جەمال پاشان دەڵێ: (ئەوەی ڕاستی بێت ئەم هۆنراوەیە هۆنراوەیەکی ساختەو دەستکردە, بە پیّی زانستی زمانەوانی دەتوانین پیشانی بدەین کە کوردیەکەی ناتوانیّ ببێتە کوردی دەوروبەری پەیدابونی ئیسلام.)

ئەمە یەکەم کاری حوزنی موکریانی و دکتور سەعید خانی کوردوستانی نیە, لێرەدا شیعرەکە هەڵناسەنگێنین( بڕوانە ڕۆژنامەی یەکگرتوو ژمارە ٥٨٤ عەبدولاّ نەجمەدین تەها) تەنها دوو نمونە لە ساختەکاری و ژیانی دکتور سەعید دەهێنینەوە,

* ئەسعەد سیراجەدین دەڵێ : (دکتور سەعید خان ئەو سیّ قەباڵەیەی بە فێڵ لە دەستی شێخ عەلادین دەرهێناوەو گەر چی بڕیار بوە دوای نواندنی بە پسپۆڕان بیداتەوە بە شێخ, بەلاّم نەیگێڕاوەتەوە و هەرسێکیانی فرۆشتون.) ( کەشکۆڵە شیعرێکی کوردی , لا ٣٨)

*ئایەتولاّ مەردۆخی دەڵیّ: (..من لە کتێبخانەکەی خۆمدا سیّ دەستنوسی هەورامیم پیّدا, یەکێکیان دیوانی (مەحزوونی) یا (بێسارانی) بوو کە باپیرم بە خەتی خۆی نوسیبوی, لە گەڵ دیوانی مەعدومی (مەولەوی) و (ڕۆستەم و زەردە هەنگەکە) ی (مەلا مستەفای دڵدڵی), بەلاّم نازانم ئەوانە چیان بە سەر هات.) ( کەشکۆڵە شیعرێکی کوردی لا ٣٨)

شیعری هورمزگان زۆر لە قافیەکانی کتێبە شیعریەکەی (مزگانی) دکتۆر سەعیدخان دەچێت, دکتور سەعید ویستویەتی لە ڕێگای ئەم هۆنراوەیەوە دەمارگیری نەتەوایەتی ببزوێنێت دژ بە ئیسلام, هەنیّ نوسەریش بەداخەوە کەوتونەتە ناو هەڵەکەوە, ئیتر بە قەست بوە یان نا کەوتونەتە هەڵەکەوە, دیارە دکتور سەعید لە ئێران و حوزنی موکریانی لە ڕەواندوز کە مەڵبەندی دەست نوس و ئاسەوارێکی زۆری جێماوی سۆران بوە, هەرچیان دەست

کەوتوە ئاودیویان کردوە بۆ بەریتانیا, کە ڕەنگە ئاینده کاری زیاتری ئەمانە ئاشکرا بکات,

بۆ زیاتر شارەزابون لە کارو کرەوەی دکتۆر سەعیدی هاوڕێی موکریانی, کورتەیەك لە ژیاننامەی دەنوسینەوە:

(سالی ١٨٦٢ز, خوا کوڕێکی بەخشیە (مەلا محەمەدی سنەیی) پێش نوێژو وتارخوێنی مزگەوتی گەورەی سنە, ناوی نا (حەمە سەعید), شیرە خۆرە بوو کە دایکی مرد, باوکی ژنی تری هێنا, ئەویش مرد, ژنی سێهەمی هێنا, حەمە سەعید تەمەنی حەوت سالٚ بوو باوکیشی مرد, کەوتە لای برا گەورەکەی, ئەویش خستیە بەر خوێندن, دوای چەند سالێك ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت, لە مزگەوتەکەی باوکیدا وانەی دەوتەوە, سالی ١٨٨٧ کۆمەلێك قەشەی گاور بۆ بلاوکردنەوەی مەسیحی هاتنە سنە, لە گەلٚ مەلاکانی سنە هەندێ وتووویژ دەکەن, گاورەکان شکست دەهێنن, (قەشە یوحەننا) بە شوێن کەسێکدا دەگەڕا فێری فارسی بکات, لە گەلٚ (مەلا حەمە سەعید) دەبنە ئاشنا, هەندێ قسەو باس دەکەوێتە نێوانیان و کۆمەلێك کتێب دەداتە مەلا حەمە سەعید, بەوتەی نەرم فریوی دەدات و بەنهێنی دەیکەنە گاوور, حەمە سەعید ئەم بارەی دەشارێتەوەو کاکی و کەس پیێی نازانێ, ئەم قەشەیە لە (ورمێ) دادەنیشێ زوو زوو سەردانی حەمە سەعید دەکات, ئەمیش وردە وردە سەردانی (ورمێی) دەکرد, لە یەکێك لەو سەردانانەدا, لە سەر دەستی گەورە قەشەی ئەوێ گاوری خۆی ڕادەگەیەنێت و, ناوی خۆی لە (مەلا سەعید) ەوە دەکاتە (میرزا سەعید)و مێزەرەکەی فڕێ دەدات, کاکی و خەلکی بەم نهێنیە دەزانن, لەژێر فشاری خەلکیدا ڕادەکات بۆ هەمەدان و جلی ئەرمەنی لەبەر دەکات و دەبێتە مامۆستای مندالەکانی (قەشە شەمعون), ئەویش لە سالی ١٨٨٨ دەیکاتە زاوای خۆی و کچە جوانەکەی پێدەبەخشێ, بەلام لە سەر قسەی خەلکی لە هەمەدان دەگیرێ و دەیخەنە زیندان, مسیۆنێرو مژدە بەخشە گاورەکان لای دەولەت هەولی بۆ دەدەن و لەزیندان ڕزگاری دەکەن, وەك چۆن موکریانیان لە زیندانی ڕەواندوز ڕزگار

کرد، لە گەڵ خۆیان خێزانی دەیبەنە (ورمێ)، لەوێوە لە گەڵ تیمێکی مژدە بەخشەکان ڕەوانەی ئەوروپا دەکرێت، لەوێشەوە لە سەر بانگێشتی مژدەدەرێك بەناوی (مستر هاگبرك) ڕەوانەی سوەید دەکرێت وساڵی ١٨٩٤ دەگاتە ستۆکهۆڵم. لە پایزی ئەو ساڵەدا دەینێرنە بەریتانیاو لە کۆلیجی پزیشکی پیێ دەخوێنن. ساڵی ١٨٩٥ز بە دکتۆری دەیگەڕێننەوە بۆ ئێران و دەیکەنە دکتۆری شا، پاشان (حەمە سەعید) دەبێتە (دکتۆر سەعید) و لە تاران کاری دکتۆری و مژدەبەخشی گاوری تێکەڵ دەکات و، شەوو ڕۆژ کاری بۆ دەکات و ناوبانگ دەردەکات. ئینجیل بە شێوەی هۆنراوە وەردەگێڕێتە سەر شێوازی هەورامی لە ژێر ناوی (مزگانی) بە چاپی دەگەیەنێت. لە تاران دۆستایەتی لە گەڵ ئەدیب وشاعیران پەیدا دەکات، یەکێك لەوانە (محەمەد تەقی مەلیك الشوعەرا، بەهار) دەبێت کە لەو کاتەدا خەریکی کتێبی (شیعر در ایران) دەبێت و داوای سەرچاوە لە دکتۆر سەعید دەکات، ئەویش شیعری هورمزگانی بۆ دەنوسێ‌و دەڵێ ئەمە کۆنترین هۆنراوەی کوردیە و دەروێشێك لەسەر چەرم دۆزیویەتیەوە، لەسەر کاغەزێك بۆی دەنوسێ، ئەویش بە نەزانی لە کتێبەکەی دەئاخنێ بێلێکۆڵینەوە بلاوی دەکاتەوە و بەیەکەم هۆنراوەی کوردی لە قەڵەمی دەدات. دوای ئەو حوزنی موکریانی ساڵی ١٩٣٠ بلاوی دەکاتەوە، دوای ئەویش (ڕەشید یاسەمی) و پاشتر (مەردۆخی) و دوای ئەویش (عەلادین سەجادی) و بەوشێوەیە بلاودەبێتەوە. لە هاوینی ١٩١٢دا دکتۆر سەعید دەچێتە هەمەدان بۆ عیلاجی ئەمیر عەلادین کە نەخۆش بوە، پاشتر بۆ نەخۆشی وەکیل الملك، لەوێشەوە دەچێتە هەورامان بۆ چارەسەری سوڵتانی هەورامان، لەوێشەوە کچەکەی شێخ عەلادین نەقشبەندی نەخۆش دەبێت چاری ئەویش دەکات، پاشان قەواڵەکان لە شێخ وەردەگرێت و دەگەڕێتەوە بۆ هەمەدان و لەوێوە بۆ تاران، ساڵی ١٩١٣ دەچێت بۆ لەندەن، پاشان دەگەڕێتەوە بۆ هەمەدان بۆ کاری (دکتۆری و مژدەدەری) کاری یەکەمی دەکاتە خزمەتکاری کاری دوەمی، بەوە ناوبانگ پەیدا دەکات. ساڵی ١٩٣٩ لە تەمەنی ٧٧ ساڵیدا لە هەمەدان بە گاوری دەمرێت و لە گۆڕستانی گاورانی

هەمەدان بە خاك دەسپێرێت.( ڕۆژنامەی یەكگرتوو ژمارە ٥٨٤ عەبدولا نەجمەدین تەها) من وای بۆ دەچم كە كتێبی (فتوح سواد العراق) كە باس لە فەتحی كوردوستان دەكات وشتی ناشرینی زۆر لەو قسانەی حوزنی موكریانی باس دەكات ، زۆر لەوە دەچێت كە ئەم كتێبە دەستچێنی دكتۆر سەعیدو موكریانی و میجەر سۆن بو بێت, كە هەرسێكیان لە یەك كاتداو لە یەك سنورو بە یەك بیرۆكەوە دژی موسوڵمانان كاریان كردوە, زۆر نزیكە ئەم سیپارەیە كە ڕۆژبەیانی كردویەتیە كوردی بە ناوی ( وڵاتگیری ڕەشە خاكی عێراق) هەڵبەستی دكتۆرو سۆن و موكریانی بوبێت, ئەمەش پێویستی بە لێكۆڵینەوەی دورو درێژوو ورد دەبێت...!!!!

## میرنشینی سۆران هەڵی دروستبوون و هۆی کەوتنی

لە مێژووی مرۆڤایەتیدا سەدان شارستانی و دەوڵەت ومیرو میرنشین, بە هەلێکی لەبار هاتون و, بە هۆیەکی ئەسەفبار لەناو چون و ڕوخاون, میرنشینی سۆرانیش یەکێك بوە لەو سنوردارانەی, کە لە ماوەیەکدا هات وچوو, لەو سەردەمەدا هەردوو دەوڵەتی عوسمانی وئێرانی لە شەڕو هەرایەکی بێسنووردابوون, کێبەرکێیان بوو لەسەر داگیرکردنی میرنشینە کوردەکان .

بێگومان دامەزراندنی ئەم میرنشینە وەك دەوڵەتێك, چەند هەل ومەرجێك کۆبونەوەو ڕەخساندیان :

*سەرەتا دەوڵەتی عوسمانی لاواز بوو, چاوی لە تەشەنەکردنی میرنشینی سۆران پۆشی, ئەو لاوازیە بوە هۆی ئەوەی گەلە ژێر دەستەکان ڕاست ببنەوە, (فرایزەر) دەڵێ (دەوڵەتی عوسمانی وەها لاواز بوو بوو کە کوردەکان حیسابیان بۆ نەدەکردو بەیەك سەعات هەولێریان گرت,) (جیمس بیلی .رحله الی بغداد,ص٢٠) شۆڕشی یۆنانیەکان دژی عوسمانیەکان بە یارمەتی ئەوروپا, پول و پارەیەکی زۆری بە عوسمانیەکان خەرج کرد, بوە هۆی داڕزان وداچۆڕانی بودجەی, هەر ئەم لاوازبونە وای کرد ڕوسیاش بەرامبەری هەڵسیێو (ئەدەنە)ی گرت کە ١٥٠ میل لە ئەستەمبوڵی پایتەختەوە دور بوو, کارێکی کرد (باب العالی) هەیبەت و نرخی ون بکات و ڕاپەڕین لە زۆر لاوە دروست ببێت.

* سوڵتان (محەمەدی دووەم) ی عوسمانی زۆر توندو تیژ بوو بەرامبەر گەلە ژێر دەستەکان, ئەوانیش بێزار بون و ڕاپەڕینیان دروست کرد.

* محەمەد عەلی پاشای میسر داوای تەعویزی کرد لە عوسمانیەکان لە باتی ئەو یارمەتیەیەی کە دای بۆ کوژاندنەوە و سەرکوت کردنی هەردوو شۆڕشی (وەهابی) لە سعودو (یۆنانی) لە بەلقان, بەلام عوسمانی تەنها دورگەی (کریت)یان دایە ئەویش ڕازی نەبوو, ناچار بە سەرکردایەتی

(ئیبراهیم پاشا)ی کوری هێرشی کردو شامی گرت, هانی (پاشا کۆرە میری سۆران) ی‌دا کە ئەویش داوای سەربەخۆیی بکات, شان بەشانی یەك دەجەنگان و بەرەو ناوەڕاستی تورکیا هێرشیان هێنا , میسر و سۆران بەردەوام پەیوەندیان هەبوو, لەشکری میسر لە شام لە سەر مەڕی کورد دەژیا, کوردەکانیش چەکیان لە میسر وەر دەگرت, سەرکەوتنی کوردەکان میسریەکانی زۆر دڵخۆش کردو پەیتا پەیتا چەکیان بۆ دەناردن و نامەیان لە نێواندا ئاڵوگۆڕ دەبوو, لە هەواڵ و نیەتی یەکتر ئاگاداربون, چونکە یەك مەبەست دەیجولاندن, پەیمانیان دابوو کە هەوڵ بدەن بۆ سەربەخۆیی کوردوستان لە ژێر ڕکێفی میر محەمەددا, وەك چۆن میسر سەربەخۆ بووبوو, گەر دەست تێوەردانی بەریتانیا نەبوایە. بە نیاز بوون زۆر بۆ ئاستانەی پایتەختی عوسمانی بهێنن.

* مێژوناس (لوتسکی) دەڵێ (ئیبراهیم باشا بە هۆی کریگرتەکانیەوە لە هەموو لایەکەوە هانی میللەتەکانی دەوروبەریان دەدا بۆ ڕاپەڕین دژی دەوڵەتی عوسمانی.

* هەڵکەوتەی ناوچەی سۆران کە شاخاوی وسەختە, لە کاتی تەنگانەدا یاریدەی خەڵکەکەی دەدات(کاوس قەفتان..سوران..لا٤٤).

* یەکێك لە ڕێگە هەرە گرنگەکانی کاروانی بازرگانی شام و عیراق بەلای ڕەواندوزدا تێدەپەڕێ, ئەوانیش باج وسەرانە و سامانێکی زۆریان لێدەست دەکەوت, وای کرد کە شێوازێك لە دەسەلاتێکی سیاسی وەربگرێت کە گەلێ ئامانجی نەتەوەیی‌ی وشەخسی پێدێتەدی.

* میرنشینی (بۆتان)یش تەواو پەرەی سەندبوو گەشەی کردبوو, هەر بەناو سەر بە عوسمانی مابویەوە, ئەوانیش لە بیری جیاخوازی بون لە عوسمانی.

* باری سیاسی میرنشینە کوردەکانی ئەو ڕۆژەش یاریدەدەرێکی چاك بوو بۆ پەرەسەندنی میرنشینی سۆران, میر نشینی (بابان) تەواو لاواز کەوتبوو, تەنانەت (فرایزەری گەڕۆك) دەڵێ نەیان توانی میوانداری من بکەن,

لەبەر ئەوە بەلای عوسمانیەوە خراپ نەبوو ئەگەر هێزێکی تر لە ناوچەکەدا دروست ببیٚ جیٚی (بابان) بگرێتەوە لە ڕوی ئێراندا. بۆیە لە سەرەتاوە چاوی لە تەشەنەی میری سۆران پۆشی، بەلاّم کەزانی دەسەلاّتی پەیدا کردوەو بۆتە مەترسی، ئەوەبوو پەلاماری دا.

* کەسێتی پاشا کوٚرە خوٚی ڕۆڵێکی بالاّی هەبوو لە پێگەیشتن و پەرەسەندنی میری سۆراندا، چونکە پێش میر محەمەد میرنشینی سۆران ئەو هێزەی نەبوو، دوای ئەویش یەکێکی تر نەبوو دروستی بکاتەوە.

* دوو بەرەکی و تەڵە بۆ یەك نانەوەی مام وخزمەکانی، کارتێکردنێکی وای لە دڵی میر محەمەددا دروست کردبوو، کە هەمیشە چاوی لەوەوە بوو کە ڕۆژێك لە ڕۆژان کار بگرێتە دەست و ئەو بارە لارەی کورد ڕاست بکاتەوە، ئەم هەستەش لە دڵ و دەرونیابوە دڵ ڕەقی، نەك هەر بۆ هێنانەدی ئامانجەکانی ، بەڵکو لای بووبوە خویەك و کاری تەواو بۆ ئاسان کردبوو لغاوی سەرکێشترین میرنشینی پێدەگرت، بۆیە لە ماوەیەکی کەمدا سنوری خۆی پیٚ فراوان کرد، دڵڕەقیەکی خراپی بەدادپەروەریەکی سەرزارەکی داپۆشیبوو. کۆبونەوەی ئەم دوو سیفەتە وەکو (میلنگن) دەڵیٚ (داگیر کەرو یاسا دانەر) (میلنگن. لا٩١) بەو دڵ ڕەقیە دزو جەردەی نەهێشت، زەبروزەنگی بەجۆرێك بوو کە بێگانە نیدەتوانی بێپرس هەنگاو بنێتە ناو میرنشینەکەیەوە، باری ناوەوەی میرنشینەکەی پیٚ بوژابویەوەو کاری کردە سەر خوڕەوشتی دانیشتوان بە جۆرێك گەڕۆکەکان دانیان بەوەدا نابوو کە هەست بە جیاوازیی ڕەوشتی ئەم میرنشینە دەکرێت لە گەڵ شوێنەکانی تری دەوڵەتی عوسمانی. *ئەو هێزەش کە هەیبوو لە هێزی میرنشینێکی بچوکی نەدەکردو لە سەربازو جبەخانەو توٚپ، هێزی بەزەبت بوو.

* دۆخی سیاسی دەرەوەی کوردی ئەو ڕۆژەش پاڵی بە میری سۆرانەوە نا خێرا پێش بکەوێت و بێتە سەر شانۆی ڕوداوەکان، دەوڵەتی عوسمانی وئێرانی لەبەر دەست بەسەراگرتنی میرنشینەکان هەرایان بوو، کەماندوش دەبون میرنشینەکانیان دەدا بە گژ یەکدا..

* میرنشـینەکانی تـری دەوروپشـتیش زۆر لاواز و داڕزاو بـوون، هـەر خـەریکی دوبـەرەکی و فیتنـە بـازی وتەڵـە بـۆ یـەك نانـەوەبون. بـەڵام بـە پێچەوانەوە پاشا کوّرە خەریکی ڕێکخستن و خۆ قایم کردن و چارە کردنی نەخۆشـیەکانەوبوو، بۆیـە یەکـە یەکـە میرنشـینە دراوسـێکانی داگـیر کـرد، بەتایبـەتی داگـیر کردنـی (میرنشـینی ئامێـدی) کـە بەمـە ناوبـانگی بـەهێزی دەرچوو چاوی میرنشینەکانی تریشی ترسان، چونکە ئامیدی زۆر سەخت ودژوارو دەوڵەمەندبوو داگیرکردنی هەروا ئاسان نەبوو..بەم جۆرە لەو سەر بەخۆییە نزیکبویەوە کە دەمێك بوو لە لاوێتیەوە لە سەری دابوو.(صالح قەفتان .مێژووی نەتەوەی کورد لا٢٩٨).

* ڕەنگـە حـەزی وابوبێـت ببێتـە هاوشـانی میسـرو ئێـران وعوسمـانی. کردەوەکانی ئەمەیان دووپات دەکردەوە. لاسایی ئەوانی دەکردەوە، لاف و گەزافی ئەوانی لێدەدا، بەتایبەت قەلاّ دروست کردن وسکەلێدان و کارگەی چەك و جبەخانە (حسەین حوزنی لا٣٩) دانانی پلەو پایەی سوپاو پۆلیس و جیاوازی وجۆری جل و بەرگیان . پایەو سیفاتی ئیداری و دادپەروەری و بەستنی پەیمانی دۆستایەتی لە گەڵ محەمەد عەلی میسر و داود پاشای بەغداد، کە گەورەترین دوژمنی عوسمانی بوون، ئەمانە دەری دەخست کە میری سۆران خەیاڵی زۆر دوور ڕۆیشتوە، بە تایبەت دەوڵەتی عوسمانی لە باتی ئەوەی سزای بدات، هات ڕوتبەی (میری میران) ی پێبەخشی (ئەمین زەکـی. خۆلاصـە تـاریخ کوردسـتان. لا ٢٢٩) ئێـرانیش دانـی نابـە میرنشینەکەیداو وەك میرنشینێك نەك وەك دەوڵەتێك (حسەین حوزنی لا٣٩) چونکە ئێران هەرچەندحەزی بە نوشوستی عوسمانی دەکرد، بەڵام ڕازی نەبوو ئەوەش لە خۆی بقەومێنێت ..

* کورت بینی میری سۆران هۆیەك بوو بۆ لە ناوچونی، ئەگەر چی ئازاو بەزەبروزەنگ بوو. بەڵام لە سیاسەتدا کورت بین و بڕوای بە بەڵێنی عوسمانی وبـەریتانیا کـردو خـۆیدا بەدەسـتەوە. هـەر ئەوەنـدە هەسـتی کـرد زروف وبارودۆخ بۆ ئەو نیە، ،سەری لێتێکچوو وازی هێنا. نەك وەك سەرۆکێکی

خاوەن ئامانج، بەڵکو وەکو یەکێك لە ڕەعیەکانی چاوەڕوانی لێبوردن بوو بە بەخشندەیی سوڵتان..

* داود پاشا والی بەغداد ڕقی لە سەریەشەی بابانەکان هەستابوو کە هەمیشە کێشە دروست دەکەن بۆ بەغدادو عوسمانی، وە زۆر لا دەکەنەوە بەلای ئێرانە شیعە مەزهەبەکاندا، دەترسا ئەو ئاینزایە کاریگەری بڵاوبونەوەی لە ناو خەڵکی کوردا هەبێت، حەزی دەکرد سۆران لە سەر حیسابی بابانەکان گەورە بێت، ئێرانیش حەزی دەکرد سۆران بە هێز بێت و گەورەبێت، بەمەرجێ لە ژێر ڕکێفی خۆیدابێت و بەرامبەر عوسمانی بوەستێت، چونکە ئێران بە شەڕی ڕوسیاوە خەریك بوو (فریزەر،لا١٢٧) ئەمانە هەلێکی مەزنی بۆ سۆران ئامادەکرد، کە بە هەر چوار لادا پەل بهاوێت و سڵ لە کەس نەکاتەوە، بەڵگەش ئەوەیە سۆران ئەو هەموو میرنشینەی دایەبەر و داگیر کرد ،کەچی نەعوسمانی و نەئێران و نەوالی بەغداد نەهاتنە دەنگ، هەڕەشەو چاو سور کردنەوەیەکیان نیشان نەدا..

# سەرچاوەكان

١ ـ شەرەفنامە . شەرەفخانی بدلیسی . وەرگێڕ بۆ كوردی هەژار موكریانی . نەجەف ١٩٧٢.

٢ـ مێژووی میرانی سۆران . حسین حوزنی موكریانی . هەولێر ١٩٦٢.

٣ـ كوردو كوردستان . محمد امین زەكی . مهابات.

٤ـ میرنشینی سۆران . كامەران جەمال بابان . هەولێر ١٤١٩.

٥ـ مێژووی كورد لەكۆنەوە تا ئەمڕۆ . سالّح قەفتان . بغداد ١٩٦٩.

٦ـ كوردەكانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی . د.جلیلی جلیل . وەرگێڕ لەروسیەوە . د.كاوس قەفتان . بغداد ١٩٨٧

٧ـ چەند لێكۆڵینەوەیەك لەمێژووی بابان سۆران بۆتان . د.كاوس قەفتان . بغداد ١٩٨٥.

٨ـ شوڕشەكانی كورد . عەلادین سوجادی . بغداد . ١٩٥٩.

٩ـ خەبات لەرێی كوردستاندا . خالفین .

١٠ـ بنەماڵانی بەناوبانگی رەواندوز . ممدوح مزوری، هەولێر ١٩٩٨.

١١ـ بابان سۆران بۆتان . دكتۆر كاوس قەفتان . بغداد ١٩٨٥.

١٢ـ مێژووی نەتەوەی كورد لەكۆنەوە تا ئەمڕۆ . سالّح قەفتان . بغداد . ١٩٦٩.

١٣ـ كتێبی حاجی قادری كۆیی، بغداد ١٩٧٣. گۆڤاری كۆڕی زانیاری كورد.

١٤ـ تأريخ العراق الحديث . دكتور عبدالعزيز نوار ، قاهيرة ١٩٦٨.

١٥ـ اليزيدية . صديق دملوجي .

١٦ ـ امارة بهدينان . صديق الدملوجي . الموصل ١٩٥٢.

١٧ـ داود پاشا والى بغداد, د.عبدالعزيز سليمان نوار . قاهرة ١٩٦٧.

١٨ـ اربعة قرون من تاريخ العراق الحديث . ترجمة ستيڤن همسلي لونگريك . ترجمة جعفر الخياط . بغداد ١٩٦٨

١٩ـ بغداد مدينة السلام . ريجارد كوك . ترجمة . مصطفى جواد وفؤاد جميل . بغداد ١٩٦٧.

٢٠ـ تأريخ الموصل . سليمان الصايغ . قاهرة.

٢١ـ الشيخ نورالدين البريفكاني . محمد أحمد مصطفى الكزني، قاهرة ١٩٨٢.

٢٢ـ اربيل في الماضي والحاضر . مجموعة من المؤلفين . ص٣٤ كەريم شارەزا.

٢٣ـ اربيل في ادوارها التاريخية .

٢٤ـ تأريخ العراق بين احتلالين، عباس العزاوي.

٢٥ـ الاكراد في بهدينان . انور المائى. ١٩٩٩دهۆك.

٢٦ـ رحله فريزر الى بغداد . جيمس بيلى فريزر . ص٢٠٠ بغداد ١٩٦٤، ترجمه جعفر خياط

٢٧ـ عشائر العراق . عباس العزاوي .

٢٨ . الامير الكردى . جەمال نەبەز . ترجمه . فخرى سلاحشور، هەولێر ١٩٩٤.

٢٩ـ من عمان الى عمادية . عەلى سەيدو گورانى . القاهره.

٣٠ـ كردستان والاكراد . عبدالرحمن قاسملو . بيروت ١٩٧٠.

٣١ـ گۆڤارى كاروان ژماره (٨) خولى راپەڕين ١٩٩٣ ئەحمەد باوەڕ .

٣٢ـ گۆڤارى كاروان ژماره ٢٣ سالّى ١٩٨٦.

٣٣ـ گۆڤارى كاروان ژماره(٢٧) ١٩٨٤.

٣٤ـ گۆڤارى كاروان . ژماره . ٣٨، عەبدولفەتاح عەلى يەحيا .

٣٥ـ گۆڤارى كاروان، ژماره (٥٢).سالى١٩٨٧ بەشى يەكەم . عەبولەتاح عەلى يەحيا

٣٦ـ گۆڤارى كاروان ژماره ٥٢ . بەشى دووەم، عبدالفتاح عەلى يەحيا .

٣٧ـ گۆڤارى كاروان ژماره (٧١، ٧٢) سالّى ١٩٨٩ .

٣٨ـ گۆڤارى كاروان ژماره(١٠٩) ١٩٩٧، تاريق جامباز .

٣٩ـ گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد . بەرگی ٥
٤٠ـ گۆڤاری روناکبیری . ژمارە (٢) ، ستوکهولم، فازیل کەریم ئەحمەد.
٤١ـگۆڤاری دەنگی زانا . ساڵی ١٩٩٤ دکتۆر محمد گەزنەیی.
٤٢ـ گۆڤاری هەڵەبجە . ژمارە . ١٨ . ١٩ مۆلنداڵ . سوید .
٤٣ـ مجلة لالش . الثقافية الصادرة عن مركز لالش في اوروبا . العدد(٤٢
٤٤ـ مجلة الحكم الذاتي . العدد (٤) السنة السابعة . زبير بلال اسماعيل . محمد الخطي ونهاية الأمارة السورانية.
٤٥... گۆڤاری ڕۆژنامەڤانی ژمارە : ٩ لا ١٣٢ هاوینی ٢٠٠٢.
٤٦... زاری کرمانجی، حوزنی موکریانی. ژمارە ٢١ ساڵی چوارەم ١٩٣٠.
٤٧... ڕۆژنامەی یەکگرتوو ژمارە ( ٥٨٤ بەروار ١١|٤|٢٠٠٦) عەبدولا نەجمەدین تەها: بابەتی ئەنفالکردنی گەلی کورد.
٤٨... ڕۆژنامەی ڕزگاری ژمارە ٢ ساڵی ١٩٩٣.
٤٩... گۆڤاری (گۆڕین) ژمارە ١١٣ ی ساڵی ١٩٧٥
٥٠... ڕەشید یاسەمی: کوردو پیوستەگی نژادی و تاریخی.
٥١... ئەنوەر سوڵتانی: کەشکۆڵە شعرێکی کوردی گۆرانی.
٥٢... عەلادین سوجادی: مێژووی ئەدەبی کوردی.
٥٣... س.ج. ئەدموندز: کورد، تورك، عەرەب.
٥٤... دکتور جەمال نەبەز: زمانی یەکگرتووی کوردی.

# ناوەرۆك


| لاپەرە | بابەت |
|---|---|
| ٣ | ڕۆڵــی مــەلای خــەتیّ لە مـیرنشینـی سـۆراندا |
| ٣ | پێش وتە |
| ٨ | سەرهەڵدانی میرنشینی سۆران |
| ٨ | زنجیرەی میرەکان |
| ١١ | میر موحەمەد (پاشا کوێرە) |
| ٢٠ | پەلاماری میرنشینەکانی بادینان و یەزیدیان و هەکاری |
| ٣٠ | ڕووخانی هەردوو میرنشینی بادینان و یەزیدیان |
| ٣٤ | نەخشەی عوسمانیەکان بۆ لەناوبردنی میر موحەمەدو داود پاشاو دەسەلاّتی موحەمەد عەلی پاشا لە شامدا |
| ٤٥ | بەریتانیا لە بەرەی دژە کوردا |
| ٤٩ | ڕووخانی میرنشینی سۆران لەنێوان بڕیاری میر موحەمەدو فتوای مەلای خەتێدا |
| ٤٩ | ڕێکەوتنی میر موحەمەدو ڕەشید پاشا |
| ٦١ | مەلای خەتیّو .. گەشتی ژیانی |
| ٦٤ | حوزنی موکریانیو دروستکردنی ئەفسانەکانی مێژوو |
| ٧٥ | دوا وتە |
| ٧٩ | ڕای حوزنی موکریانی بەرامبەر ئیسلام ومەلا و پیاوە ئاینیەکان |
| ٨٤ | بەریتانیاو پیاوانی بەریتانی لە دیدی موکریانیەوە |
| ٨٦ | حوزنی موکریانیوشیعرە هەڵبەستراوەکەی هورمزگان |
| ٩٢ | میرنشینی سۆران هەڵی دروستبوونو هۆی کەوتنی |
| ٩٧ | سەرچاوەکان |
| ١٠٠ | ناوەڕۆك |

## له بڵاوکراوەکانی پرۆژەی (تیشک)

| زنجیره | ناوی کتێب | نووسەر |
|---|---|---|
| ١ | بە ئیسلامکردنی کورد ماستەرنامە یان هەڵەنامە | فازیل قەرەداغی |
| ٢ | نەزانیی و بێشەرمیی بەشێك لە چەواشەکارییەکانی مەریوان هەڵەبجەیی لە کتێبی (سێکس و شەرع و ژن)دا | عومەر کەمال دەروێش |
| ٣ | ئاشتینامەوەڵامێك بۆ خوێننامەی زەردەشتی | ئامینە سدیق عەبدولعەزیز |

لـه هـەڵبـەستنی فـەتواكـەی (مـەلای خەتـێ)دا، كۆمەڵێك مەبەستی جۆراوجۆر كۆدەبنـەوە و لـە خاڵێكدا یەكدەگرنەوە، موكریانی بەم بوختانە لای سەید تەهای ڕەواندوز جێی خۆی دەكاتەوە، سەید تەهاش دژ بـە بنەماڵـەی خـەتێی نەیاری جۆش دەبێت، چەپەكانیش دەستی چـەوروو چـەند سەدەیەك لـە بێئەزموونـی و شكستی سەركـردە كوردەكان بـە مێـزەری سپیی مـەلاكـان دەسڕن كـە ڕەمـزی موسڵمانـانن.

## پرۆژەی تیشك:

چـەند قـەڵـەمێـكـە، ئـەركی ئاشكراكـردنـی زانیاریی هەڵـەو هەڵبـەستن و چـەواشەكـاریـی گرتۆتـەخۆ كـە لـە نـووسینە كـوردییـەكـانـدا تـەشـەنـەی كـردووە، بـە تـایبـەت لـەو بابەتانەی پەیوەندییان بە ئیسلام و قـورئـان و پـێغـەمبـەرەكـەی و مێـژووی ئیسلامـەوە هـەیـە.

ئـەم كتـێبـە چـوارەم بـەرهـەمـی پـرۆژەی (تیشك)ە، كە دەرگاكەی بۆ هەموو نووسەرێك كردووەتەوە تیایدا بەشدار بێت.

نرخ ( ١٥٠٠ ) دینار